زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست

③

# چۆنێتی

## نوێژی پەیامبەری خوا



لە تەکبیرەی ئیحرامەوە تاکو سەلامدانەوە هەروەکو چۆن لەپێش چاوتا بێت

" صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي " ( متفق عليه ).

نووسینی زانای فەرمووودەناسی سەردەم

پێشەوا : شێخ محمد ناصرالدين الألباني

وەرگێڕانی : عەدنان بارام کەلاری

کتێبخانەی پێشین　　نوسینگەی شافعی

زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست

( ٣ )

# چۆنێتی

# نوێژی پەیامبەری خوا 

**لە تەکبیرەی ئیحرامەوە تاکو سەلامدانەوە هەروەکو چۆن لەپێش چاوتا بێت**

" صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي " ( متفق عليه ) .

**نووسینی زانای فەرموودەناسی سەردەم**

**پێشەوا : شێخ محمد ناصرالدين الألباني**

**وەرگێڕانی : عدنان بارام کەلاری**

بسم الله الرحمن الرحيم




ناوی کتێب : **چۆنیەتی نوێژی پەیامبەری خوا ﷺ لە تەکبیرەی ئیحرامەوە تاکو سەلامدانەوە هەروەکو چۆن لە پێش چاوتا بێت .**

ناوی نووسەر : **پێشەوا : شێخ محمد ناصرالدین الألباني .**

ناوی وەرگێڕ : **عدنان بارام کەلاری .**

ژمارەی سپاردن : **ژمارە ( ٦٦٢ ) ی ساڵی ( ٢٠٠٤ ) پێدراوە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە .**

زنجیرە : **زنجیرەی (٣) سێیەم لە زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست .**

نۆرەی چاپ : **چاپی چوارەم ( چاپێکی هەڵەچنکراوە ) .**

ساڵی چاپ : **( ١٤٣٤ هـ - ٢٠١٣ م ) .**



abo.sunnah@gmail.com


---


**لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی پێشین / هەولێر**

فولکەی شێخ محمود، ژێر باڵەخانەی تەلەفزیۆنی تورکمان

٠٧٥٠٤٧٩٤٢٤٢


---

**بنکەکانی بڵاوکردنەوە**

| | |
|---|---|
| کتێبخانەی پێشین – هەولێر | سەنتەری کارزان – چەمچەماڵ |
| تۆمارگای شافعی – هەولێر | کتێبخانەی سوننە – سلێمانی |
| کتێبخانەی صهیب – کۆیە | کتێبخانەی الأثر – سلێمانی |
| کتێبخانەی دێرین – سۆران | کتێبخانەی زانستی بەسوود - کەلار |
| کتێبخانەی سیما –چەمچەماڵ | کتێبخانە و تۆمارگای بەهەشت - کەلار |

**تێبینی : دەتوانی ئەم کتێبە و سەرجەم نووسین و وەرگێڕانەکانی عدنان بارام کەلاری**

**لە ماڵپەڕی باوکی سوننە بخوێنیتەوە : ( www.abosunnah.com )**

**وە لە ماڵپەڕی بەهەشت : ( www.ba8.org ) .**

# پێشەکی وەرگێڕ

إنَّ الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ ، وَنَعُوْذُ باللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا ، وَمِنْ سَـيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا ، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾ ( آل عمران : ١٠٢ ) .

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾ ( النساء : ١ ) .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ ( الأحزاب : ٧٠ ـ ٧١ ) .

أَمَّا بَعْدُ ... فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ الله ، وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ ، وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا ، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ ، وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ .

**موسڵمانی یەکخواپەرەست :** ( **نوێژ** ) یەکێکە لەو پێنج پایە ، و بنەوایانەی کە ئاینی ئیسلامی پیرۆزی لەسەر بنیات نراوە ، هەروەکو ( عبدالله ) ـی کوڕی ( عمر ) ـ ڕەزای خوا لە خۆی و باوکی بێت ـ بۆمان دەگێڕێتەوە کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " بني الإسلام على خمس : شهادة أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا عبده ورسوله ، وإقام الصلاة ، وإيتاء الزكاة ، والحج ، وصوم رمضان "[1] ، واتە : ئاینی ئیسلامی پیرۆز لەسەر پێنج پایە ، و بنەوا بنیات نراوە : شایەتی دان بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نیە کە شایستەی پەرستن بێت ئیللا ( الله ) نەبێت ، و هیچ کەسێکیش شایستەی شوێن کەوتن نیە ئیللا ( محمد ) نەبێت ﷺ ، پاشان پێنج فەرزەکانی نوێژ ئەنجام بدات ، و زەکاتی ماڵ و سامانەکەی بدات ، ئەگەر گەشتە ئەوەی کە زەکاتی لەسەر بێت ، و حەجکردنی کەعبەی پیرۆز ، و گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان .

---

[1] متفق عليه .

هەروەها ( **نوێژ** ) نیشانەی هەرە گەورەی جیاکەرەوەی موسڵمانانە لە بێباوەڕان ، هەروەکو پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " بين الرجل وبين الكفر ترك الصلاة "[٢] ، واتە : ئەو کردارەی کە جیاکەرەوەیە لە نێوان موسڵمانێتی مرۆڤ کافر بوونی وازهێنانە لە نوێژ .

وەخوای پەروەدگار کردوویەتی بە بنەوایەك بۆ جێگیر بوونی برایەتی لە نێوان موسڵماناندا ، هەروەکو فەرموویەتی : ﴿ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَنُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ ( التوبة : ١١ ) ، واتە : ئەگەر تۆبەیان کرد و نوێژەکانیان ئەنجامدا ، و زەکاتیشیاندا : ئەو کاتە بەبراتان دەژمێررێن لە ئاین دا ...

وە خوای پەروەدگار ئەنجام نەدانی ئەم کردارەی بە هۆکارێك باسکردووە بۆ ڕۆشتنە ئاگری دۆزەخ ـ خوا پەنامان دات ـ هەروەکو لە باسی پرسیار لێکردنی دۆزەخیەکاندا فەرموویەتی : ﴿ مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ﴾ ( المدثر : ٤٢ ـ ٤٣ ) ، واتە : چی وای لێ کردن بڕۆنە سەقەرە ـ کە ناوێکە لە ناوەکانی دۆزەخ ـ لە وەڵامدا دەڵێن : چونکە لە نوێژگەران نەبووین .

جا موسڵمانی بەڕێز : کردارێك پایە و بنەوایەك بێت لە بنەواکانی ئاینی ئیسلامی پیرۆز ، و نیشانەی جیاکەرەوەی تۆ بێت لە بێباوەڕان ، و هۆکاری جێگیر بوونی برایەتیت بێت لە گەڵ موسڵماناندا ، و هۆکارێکیش بێت ـ لە کاتێك دا ئەگەر ئەنجامی نەدەیت ـ بۆ ڕوشتنت بۆ ئاگری دۆزەخ ـ خوای پەروەردگار پەنای من و تۆش بدات لە دۆزەخ ـ جێی خۆیەتی هەوڵ و کۆششێکی زۆری بۆ بخەیتە گڕ بۆ ئەوەی بە تەواوی لێی شارەزابیت ، بە باشترین شێوە ئەنجامی بدەیت .

بۆ ئەوەی ( **نوێژ** ) ـەکەت ببێت بە هۆکارێك بۆ بە دەست هێنانی پەیمانی خوای پەروەردگار و بیکات بە هۆکاری لێ خۆشبوونی لێت ، نەك بەواز لێهێنانی ئەو پەیمانەی خوای پەروەردگارت لە دەست بدەیت ، هەروەکو پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " خمس صلوات افترضهن الله تعالى من أحسن وضوءهن ، وصلاهن لوقتهن ، وأتم ركوعهن وخشوعهن : كان

---

[٢] ( صحيح الترغيب والترهيب رقم : ٥٦٣ ) .

له على الله عهد أن يغفر له ، ومن لم يفعل فليس له على الله عهد ، إن شاء غفر له ، وإن شاء عذبه " [٣] ، واتە : پێنج نوێژن خوای پەروەردگار فەرزی کردوون : ئەو کەسەی دەستنوێژەکەی بەباشی بشوات ، و لە کاتی خۆیاندا ئەنجامیان بدات ، و کڕنووشەکانیان بەتەواوی ببات ، تێیدا دڵکزی هەبێت ( الخشوع ) ، ئەوا خوای پەروەردگار پەیمانی داوە لە ئەنجامدەرانی خۆش بێت ، بەڵام ئەگەر هەر کەسێك ئەوەی ئەنجام نەدا ئەوا هیچ پەیمانێکی لە لای خوای پەروەردگار نیە ، ئەگەر بیەوێت لێی خۆش دەبێت ، ئەگینا سزای دەدات .

جا نوێژگەری یەکخواپەرست : لە بەر هەموو ئەو هۆکارانەی سەرەوە ، و سەلماندنی شوێنکەوتنی تەواوت بۆ پەیامبەری خوا ﷺ ، لەو فەرمانەیدا کە فەرمانی پێکردوویت ، و تێیدا فەرموویەتی : " صلوا كما رأيتموني أصلي" [٤] ، واتە : نوێژ بکەن هەروەکو چۆن منتان بینیوە نوێژ دەکەم .

ئامۆژگاری ئەوەت دەکەم ئەم کتێبەی کە لە بەر دەستتدایە ( **چۆنیەتی نوێژی پەیامبەر ﷺ لەتەکبیرەی ئیحرامەوە تاکو سەلامدانەوە هەروەکو چۆن لە پێش چاوتا بێت** ) بە ووردی بخوێنیتەوە ، پاشان هەوڵی ئەوە بدەیت هەموو نوێژەکانت بەپێی ئەو زانیاریانەی کە تێیدایە ئەنجام بدەیت ، بەڵکو خوای پەروردگار بە میهرەبانی و بە بەزەیی خۆی نوێژ لە من تۆش وەرگرێت ، کتێبەش لە نووسینی زانای پایەبەرزی ئیسلام ، و فەرموودەناسی سەردەم شێخ ( محمد ناصر الدين الألباني ) ـ رحمه الله ـ بەڕەحمەت بێت ـ کە تێیدا هەموو هەوڵێکی ئەوە بووە هەموو ووتەو کردەوەیەکی ( صحيح ) ـی پەیامبەری خوامان ﷺ بۆ بخاتە ڕوو سەبارەت بە ( نوێژ ) ، بەشێوەیەك ئەو کردارەت بۆ بەرجەستە دەکات وەکو ئەوەی بڵێیت پەیامبەری خوا ﷺ لە پێش چاوتا بێت و نوێژت بۆ دەکات بۆ ئەوەی تۆش لاسایی بکەیتەوە ، بەو شێوەیەی کە پەیامبەری خوا ﷺ هەوڵی بۆ داوە بەکردار و گوفتاری خۆی لە ژیانیدا ، هەروەکو جارێکیان بە سەر مینبەرەکەیەوە نوێژ دەکات ، و پاشان دەفەرموویت : "

---

[٣] صححه الألباني في ( صحيح أبي داود : ٤٥١ و ١٢٧٦ ) .

[٤] متفق عليه .

إنما صنعت هذا لتأتموا بي ولتعلموا صلاتي " [٥] ، واتە : ئـەوەم بـۆ ئـەوە ئەنجامـدا بـۆ ئـەوەی چۆنیێتی نوێژەکەم فێربن .

پەیڕە و ( مەنهەج ) ـی ئەم زانا پایەبەرزەی ئیسلام ، و فەرموودەناسەی سـەردەم ـ بـە ڕەحمەت بێت ـ لەم پەرتوکەیدا ئەوەبووە کە ـ هەروەکو خۆی ئاماژەی بۆ کردووە ـ : هەموو ئەو فەرموودانە کۆبکاتەوە کە سەبارەت بە نوێژی پەیامبەری خوا ﷺ پێمان گەشتووە ، لە گـەڵ دەرخستن و دیاری کردنی ووتە ڕەوا لە بۆچونە فیقهیەکان ، بێ پابەند بوون ، و دەمارگیری بـۆ بۆچون و مەزهەبێکی دیاری کراو ، و بێ گوێدانە ڕەزامەندی ئەم و ئەو ، ئەگەر ڕازی بوونیان هۆکاری تورەبوونی خوای پەروەدگار بێت ، ئەم پەیڕەوەش ـ پەیڕەوی پابەند بوون بـە قورئـانی پیرۆز و فەرمود دە ( صحيح ) ـەکانی پەیامبەری خوا ﷺ بێ پابەنـد بـوون بـە بۆچـوون و مەزهەبێکی دیاری کراوەوە ـ پەیڕەوی ئەهلی حەدیسە ، بە درێـژای مێـژووی پرشـنگداریان ، شوێنکەوتوانی بۆ مەزهەبی ڕەوای پێشەوایانی ئیسلام ( چوار پێشەوا بە ڕێزەکەی ئیسلام ) ـ بەڕەحمەت بن ـ کە هەموویان هاودەنگن لە ووتنی ئەوەی کە ئەگـەر فەرموودەیـەك جـێگیر و سەلمێنرا ئەوا نابێت پێچەوانەی ببیتەوە لە بەر ووتـەی هـیچ کەسـێك ، و ئـەو بەڕێزانـە بـە مەزهەبی خۆشیانیان زانیوە ، هەروەکو پێشەوایان شافعی ـ بەڕەحمەت بێت ـ و ئەبو حەنیفەش ـ بەڕەحمەت بێت ـ فەرموویانە : " إذا صحَّ الحديث فهـو مـذهبي " [٦] ، واتـە : ئەگـەر فەرموودەیەك جێگیر بوو و سەلمێنرا ئەوا مەزهەب و بۆچوونی منە .

وە پێشەوا مالك ـ بەڕەحمەت بێت ـ فەرموویـەتی : " إنما أنا بشر أخطيء و أصـيب ، فانظروا في رأيي : فكل ما وافق الكتاب والسنة فخذوه وكل ما لم وافق الكتـاب والـسنة فاتركوه " [٧] ، واتە : منیش وەکو ئێوە مرۆڤم هەڵەش دەکەم و دەیشی پێکم ، بۆیە بڕواننـە ووتـەکانم ،

---

[٥] متفق عليه .

[٦] ابن عابدين في ( الحاشية : ١ / ٦٣ ) ، و الشيخ صالح الفلاني في ( إيقاض الهمم : ص ٦٢ ) ، و النووي في ( المجموع ) ، و الشعراني ( ١ / ٥٧ ) .

[٧] ابن عبدالبر في ( الجـامع : ٢ / ٣٢ ) ، وعنه ابن حـزم في ( أصول الأحكـام : ٦ / ١٤٩ ) وكـذا الفـلاني ( ص ٧٢ ) .

هەرکامەیان هاودەنگ بوو لـە گـەڵ قورئـانی پـیرۆز و سـوننەتدا ئـەوا وەریگـرن ، وە ئەگـەر پێـچەوانەی قورئانی پیرۆز و سوننەت بوو ئەوا پشت گوێی بخەن .

یان فەرموویەتی : " كل حديث عن النبي ﷺ فهو قولي ، وإن لم تسمعوه مني " [٨] ، واتە : ئەگەر فەرموودەیەك جێگیر بوو و سەلمێنرا لە پەیامبەری خـوا ﷺ ئـەوا وتـەی منـە ، بـا لێشمەوە نەیبیستن .

وە پێشەوا ئەحمەد ـ بەرەحمەت بێت ـ فەرموویەتی : " لا تقلدني ، ولا تقلـد مالكـا ، ولا الشافعي ، ولا الأوزاعي ، ولا الثوري ، و خُذ من حيث أخذوا " [٩] ، واتە : نە لاسایی مـن بكەن ، و نەش لاسایی مالك ، و نەش شافعی ، و نەش ئەوزاعی ، و نەش ( الثوري ) ، بەڵكو لەو شوێنەوە وەریگرن كە ئەوان وەریان گرتووە .

جا موسڵمانی شـوێنكەوتەی پەیامبـەر ﷺ : ئەمـە وتـەی پێـشەوایانتە كـە زانـای پایەبەرزی ئیسلام ، و فەرموودە ناسسی سەردەم شێخ ( محمد ناصر الـدين الألبـاني ) ـــە ـ بەرەحمەت بێت ـ كردوویەتی بە پەیڕەو بۆ پەرتوكەكەی ، نەكەی گوێبیستی وتەی پڕو پووچی ئەم و ئەو بیت ، ئەو كەسانەی كە نەخۆشن ، یان تەعەسوبی مەزهەبایەتی كوێری كردوون .

**ئەوەش جێگەی ئاماژە پێكردن بێت ئەوەیە كە پەیڕەوی وەرگێڕانی ئەم كتێبە ئەوەیە :**

١ ـ ئـەو فـەرموودانە كە بـاس لـە چـۆنێتی نوێـژی پەیامبـەری خـوا ﷺ دەكـات ، گێڕانەوەی هاوەڵان بێ یـان تەقریر كردنەكـانی پەیامبەری خوا ﷺ ، ڕاستەو خۆ وەرگێڕراوەتە سـەر زمـانی كـوردی .

٢ ـ بەڵام ئەو فەرموودانەی كە وتـەی پەیامبـەری خوایـە ﷺ ، دەقـی عەرەبیەكـەی نووسـراوە ، پاشان لە پاش دانانی وشەی ( واتە : ... ) كراوەتە كوردی .

٣ ـ ئەو پەراوێزانەی كە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە بابەتی كتێبەكـەوە هەیـە ، وەرگێڕراوەتـە سەر زمانی كوردی ، جگە لەو پەراوێزانەی كە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بـە بابەتەكـەوە هێنڕاوەتـەوە بۆ چاپەكانی تر ـ إن شاء الله ـ .

---

[٨] ابن أبي حاتم ( ص ٩٣ ــ ٩٤ ) .

[٩] الفلاني ( ١١٣ ) ، وابن القيم في ( الإعلام : ٢ / ٣٠٢ ) .

٤ ـ بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی پەڕەکان سەرچاوەکان لا براون .

٥ ـ ئەو ئایەتانەی کە هێنراونەتەوە ، بە کورتی واتاکراونەتە سەر زمانی کوردی.

لە کۆتایدا بە هەموو ملکەچی ، و زەلیلیەکەوە ، و لە ناخی دڵمەوە داواکارم لە پەروەردگاری میهرەبانم ئەم ووتە و کردارانەمان تەنها لە بەر ڕەزامەنی ئەو بێت ، نەك لە ڕۆژی دوایدا پێمان بڵێت : ئەوەی کردەوەکەتان بۆ کرد لە دونیادا پێتان ووترا ، وە ئەگەر هەر کەم و کوڕیەکیشی تێدا بێت بە بەزەیی خۆی کردای لە گەڵدا بکات چونکە ئەو ئەهلی تەقوا و لێخۆشبوونە : ﴿ أَهْلُ التَّقْوَى وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ ﴾ ، وە لە ڕۆژێکدا پاداشتمان بداتەوە کە : ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ ( الشعراء : ٨٨ ــ ٨٩ ) .

وسبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك ، وأتوب إليك

وصلى الله وسلم وبارك على محمد ، وعلى آله وصحبه أجمعين .

وەرگێڕ :

٥ ی / شعبان / ١٤٢٥ ك

١٨ ی / ٩ / ٢٠٠٤ ز

عێراق / کوردستان / کەلار

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەكی یەكەمی نووسەر

شوكر وستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی كە نوێـژی لەسـەر بەنـدەكانی فـەرزكردوە ، و فەرمانیـشی پێكـردوون بـە ئەنجامـدانی ، و بـە باشـی ئـەداكردنی ، و سـەركەوتن سەرفرازیشی پێوە پەیوەسـت كـردووە بـە دڵكـزی و خـشوع تێیـدا ، و كردوویـەتی بـە جیاكەرەوەی بڕوا بوون لە كافرێتی ، و كردوویەتی بە هۆكاری نەهی كردنیش لە خراپە و ناپەسەندیەكان .

صەلات و سەلامیش لەسەر پەیامبەرمان بێت ﷺ كە خوای پەروەردگار سـەبارەت بـەو فـەرموویەتی : ﴿ بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ [١] ، و پەیامبەری خواش ﷺ بە باشترین شێوە بەم كار وكردارە هەستاوە ، و نوێژیش گرنگترین و گەورەترینی ئەو كردارانە بـووە كـە بـۆ خـەڵكی ڕوون و ئاشـكرا كردووە ، بە ووتە و كرداریش ، بە شێوەیەك جارێكیان بـە سـەر مینبەرەكەیـەوە نوێـژی ئەنجام دا ، بە سەریەوە دەوەستێت و سوژدەش دەبات ، و پاشان پێی فـەرموون : " إنمـا صنعت هذا لتأتـموا بي ولتعلموا صلاتي " [٢] ، واتە : بۆیە ئەمـەم ئەنجامدا بـۆ ئـەوەی لاسایم بكەنەوە و فێری چۆنێتی نوێژەكەم ببن .

وە پێویستیشی كردووە لەسەرمان لاسایی بكەینەوە ، و شوێنی بكـەوین تێیـدا ، و فەرموویەتی : " صلوا كما رأيتموني أصلي " [٣] ، واتە : نوێـژ بكـەن هـەروەكو چـۆن منتان بینیوە نوێژ دەكەم .

---

[١] النحل : ٤٤ .

[٢] البخاري ومسلم ، وسيأتي في القيام بتمامه .

[٣] البخاري ومسلم ، وأحمد وهو مخرج في ( إرواء الغليل ) تحت الحديث : ٢١٣ .

وە موژدەشی داوە بەو کەسەی کە نوێژەکەی وەکو نوێژەی ئەو ئەنجام بدات ، بەوەی کە لە لای خوای پەروەردگار پەیمانی ئەوەی هەیە کە بیخاتە بەهەشتەوە ، و فەرموویەتی : " خمس صلوات افترضهن الله ــ عز وجل ــ من أحسن وضوءهن ، وصلاهن لوقتهن ، وأتم ركوعهن ، وسجودهن ، وخشوعهن ؛ كان له على الله عهد أن يغفر له ، ومن لم يفعل ؛ فليس له على الله عهد ، إن شاء غفر له ، وإن شاء عذبه " [٤] ، واتە : پێنج نوێژ خوای پەروەردگار فەرزی کردوون ، جا هەر کەسێك ، دەستنوێژەکەیانی بە تەواوی و تێروتەسەلی ئەنجامدا ، و لە کاتی خۆشیاندا جێبەجێی کردن ، کڕنووش و سوژدەکانیشی بە تەواوی بە جێهێنان ، تێیدا دلکزی و خشوعی هەبوو ، خوای پەروەردگار پەیمانی داوە کە لێی خۆش بێت ، بەڵام ئەو کەسەی ئەنجامی نەدات ، ئەوا خوای پەروەردگار هیچ پەیمانێکی نەداوە لێی خۆش ببێت .

وە درووود و سەلامیش لەسەر یار و هاوەڵانی لە خوا ترس ، و چاکە کارانی بێت ، ئەوانەی کە پەرستشەکانی پەیامبەریان ﷺ پێ گەیاندووین ، ووتەکانی بێت یان کردارەکانی ، و بە تەنهاش کردوویانەتە بۆچوون و لاسایی کار و پەیڕەوی خۆیان ، وە سەلام و درووود لەسەر ئەوانەش کە شوێنکەوتەی ئەوانن ، و ڕێگەکەشیانیان گرتۆتە بەر تا ڕۆژی دوای .

وە پاشان : پاش خوێندنەوە ، و دەورکردنەوەم بۆ ( كتاب الصلاة ) لە ( الترغيب والتهيب ) ـی ( الحافظ المنذري ) ـ بە ڕەحمەت بێت ـ بۆ هەندێك لە برایانی سەلەفیمان تەواوکرد ـ ئەوەش نزیکەی چل ساڵ لە مەو پێش بوو ـ بۆمان ئاشکرا بوو کە نوێژ چ پلە و پایەیەکی هەیە لە ئیسلامدا ، وە ئەو کەسەش کە بە تەواوی و باشی ئەنجامی بدات چ ئەجر و پاداشت ، و ڕێزێکی هەیە ، ئەو ئەجر و پاداشت ، و ڕێزەش دەگۆڕێت ـ زیادکردن و کەمکردنی ـ بە پێی نزیك و دووری لە نوێژی پەیامبەرەوە ﷺ هەروەکو

---

[٤] قلت : وهو حديث صحيح ، صححه غير واحد من الأئمة ، وقد خرجته في ( صحيح أبي داود : ٤٥١ / ١٢٧٦ ) .

خۆی ئاماژەی بۆ کردووە ، بەو ووتەیەی : " إن العبد ليصلي الصلاة ، ما يكتب له منها إلا عشرها ، تسعها ، ثمنها ، سبعها ، سدسها ، خمسها ، ربعها ، ثلثها ، نصفها " [٥] ، واتە : بەندەکانی خوای پەروەردگار نوێژ دەکەن ، بەڵام ئەو نوێژەی بۆ نا نووسرێت جگە لە دەیەکی ، یان نۆیەکی ، یان هەشت یەکی ، یان حەوت یەکی ، یان شەش یەکی یان پێنج یەکی یان چوار یەکی یان سێ یەکە یان نیوەی .

بۆیە لە بەر ئەوە ئەو برایانەم ئاگادارکردەوە کە ناتوانین ئەدای بکەین بە تەواوی ـ یان نزیك لەوە ـ ئیللا ئەگەر چۆنێتی نوێژی پەیامبەر ﷺ بە تەواوی بزانین ، و ئەوەی کە تێیدایە لە : واجب و ئاداب و شێواز و ئەو پارانەوە و زیکرانا ، پاشان هەوڵی ئەوەشمان دا کە بە کردەوە ئەوە پیادە بکەین ، پاش ئەوە ئاواتی ئەوەمان هەبێت کە نوێژەکەمان نەهیمان لێ بکات لەخراپە و خراپەکاری ، و ئەو ئەجر و پاداشتەشمان بۆ بنووسرێت بەو شێوەیەی کە سەبارەت بە نوێژ هاتووە .

وە لە کاتێکدا زانینی ئەو کارە بەو شێوە فراوان و گشتی یەی کارێکی ئاسان نەبوو لەسەر زۆربەی خەڵك ـ تەنانەت لەسەر زۆر لە زانایانیش ـ بە هۆی پابەند بوونیان بە بۆچون و مەزهەبێکی دیاریکراوەوە ، وە ئەو کەسانەش کە خەریکی خزمەتی سوننەتی پەیامبەری خوان ﷺ ـ کۆکردنەوە بێت یان تێگەیشتن ـ بە ئاگان لەوەی کە لە هەندێك مەزهەبدا سوننەت گەلێك هەن لە مەزهەبەکانی تردا نیە ، بەڵکو لە هەندێکیاندا شتی وا هەیە نابێت نیسبەت بدرێتە پاڵ پەیامبەری خوا ﷺ ووتە بێت یان کردار ، زۆربەشی لە پەرتوکی دوایینەکاندا بە دی دەکرێت ، و زۆر جاریش دەیانبینین سوڕن لەسەری و جەختیان لەسەر کردووە بە نیسبەتدانی ئەو کردارانە بۆلای پەیامبەری خوا ﷺ ، لە بەر ئەوە زانایانی فەرمووده ( علماء الحديث ) ـ خوای پەروەردگار پاداشتی خێریان بداتەوە ـ لەسەر ئەو فەرموودانە پەرتوکی تایبەتیان داناوە و پلەی

---

[٥] صحيح : رواه ابن المبارك في ( الزهد : ١٠ / ٢١ / ١ ــ ٢ ) وأبو داود والنسائي بسند جيد ، وقد خرجته في ( الصحيح ) المذكور ( ٧٦١ ) .

فەرموودەکانیان تێدا لە ڕووی ( صحيح ) ، و (ضعيف ) ، و نانەدەمەوە ( وضع ) ـەوە دیاریکردووە ، وەك پەرتوكی ( العناية بمعرفة أحاديث الهداية ) ، و ( الطرق والوسائل في تخريج أحاديث خلاصة الدلائل ) کە هەردووکیان لە نووسینی شێخ ( عبد القادر بن محمد القرشي الحنفي ) یە ، و ( نصب الراية لأحاديث الهداية ) ـی ( الحافظ الزيلعي ) و کورتەکەشی ( الدراية ) یە کە هی ( الحافظ ابن حجر العسقلاني ) ، و ( التلخيص الحبير في تخريج أحاديث الرافعي الكبير ) کە ئەمەشیان هەر هی ئەوە ، وە جگە لە مانەش کە باسکردنیان دەبێتە هۆی درێژە پێدان .

**دەڵێم :** لە کاتێکدا زانینی ئەوە بەو شێوە فراوان و گشتی یەی کارێکی ئاسان نەبوو لەسەر زۆربەی خەڵك ، ئەم پەرتوکەم بۆ نووسین ، بۆ ئەوەی چۆنێتی نوێژی پەیامبەری خوا ﷺ فێر بن ، و بە هۆیشیەوە هیدایەت وەرگرن تێیدا ، و داواکاریشم لە خوای پەروەردگار ئەوەمان بکاتە نسیب کە لەسەر زمانی پەیامبەرەکەی ﷺ پێی داوین " من دعا إلى هدى ، كان له من الأجر مثل أجور من تبعه ، لا ينقص ذلك من أجورهم شيئا ... هتد فەرموودەکە " [٦] ، واتە : هەر کەسێك بانگەشە بکات بۆ چاکەکاریەك ، ئەوا ئەوەندەی پاداشتی ئەو کەسانەی بۆ دەنووسرێت کە شوێنی کەوتوون ، بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ئەوانی تر کەم بکات .

---

[٦] رواه مسلم وغيره وهو مخرج في ( الأحاديث الصحيحة : برقم : ٨٦٣ ) .

## هۆی نووسین و دانانی ئەم کتێبە

وە لە کاتێکدا کتێبێکی کۆکەرەوەم نەبینیوە لەم بابەتەدا ، بۆیە ئەوەم بە پێویست زانی لەسەر خۆم کە کتێبێکی تێروتەسەل بۆ برایانی موسڵمانم - کە پەرۆشی شوێنکەوتنی پەیامبەرن ﷺ لە پەرستشەکانیان - دابنێم ، کە تا لە توانامدا بێت ئەو بابەتانە بگرێتە خۆی کە سەبارەت بە نوێژی پەیامبەری خوا ﷺ هاتبێت هەر لە تەکبیرەی ئیحرامەوە تاکو سەلام دانەوە ، بە شێوەیەك ئاسان و سووك بێت هەر کەسێك - ئەو کەسانەی کە بە ڕاستی پەیامبەری خوایان ﷺ خۆش دەوێت - چاوی پێ بکەوێت ، هەستێت بە جێ بە جێ کردن و پیادەکردنی ئەو فەرمانەی پەیامبەر ﷺ کە تێیدا فەرموویەتی : " صلوا كما رأيتموني أصلي " .

ئا لە بەر ئەمە بوو قۆڵم لێ هەڵماڵی و دەستم کرد بە بەدواداچوون بە دوای ئەو فەرموودانەی کە پەیوەستن بەوەی کە من مەبەستم بوو ، لە پەرتوکە جیاوازەکانی فەرموودە ، ئاکامی ئەوەش ئەم پەرتوکە بوو کە لەبەر دەستی تۆدایە ، وە ئەوەشم کردووە بە مەرج بە سەر خۆمەوە کە تەنها ئەو فەرموودانە بهێنمەوە کە لە پەیامبەرەوە ﷺ جێگیر و سەلمێنراون لە ڕووی سەنەدەکانیانەوە ، بە پێی یاسا و بنەماکانی فەرموودەناسی ، و دووریشم گرتووە لە هەموو ئەو فەرموودانەی کە تەنها کەسێکی نەناسراو ( مجهول ) ، یان ( ضعيف ) ـی تێدابێ بەبێ جیاوازی لەوەی کە لە باسی شێوازەکانی نوێژدا هاتبێت ، یان ئەزکارەکان ، یان چاکەکانی ، و جگە لەمانەش ، چونکە بیروباوەڕم وایە تەنها ئەو فەرموودانەی کە جێگیر و سەلمێنراون * لە پەیامبەرەوە ﷺ بێ کەم و کوڕی یە ، و هیچ پێویستیەکمان بە فەرموودەی ( ضعيف ) نابێت ، چونکە - بە بێ گومان - جگە لە گومان ناگەیەنن ، گومانێکیش کە بەرامبەرەکەی لەو ئەو لا ترێت ( مرجوح )

---

* **فەرموودەی جێگیر و سەلمێنراو :** هەردوو جۆری ( صحيح ) و ( حسن ) دەگرێتەوە ، بە هەردوو بەشەکانیانەوە کە : ( صحيح لذاته ) و ( صحيح لغيره ) ، و ( حسن لذاته ) و ( حسن لغيره ) ین .

هەروەكو خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾ ( النجم : ٢٨ ) ، وە پەیامبەری خواش ﷺ فەرموویەتی : " إياكم والظن ؛ فإن الظن أكذب الحديث " [٧] ، وە خوای پەروەردگاریش داوای لێ نەكردووین كە خوا پەرستی پێ بكەین ، بەڵكو پەیامبەری خوا ﷺ نەهی لێكردووین و لێی قەدەغەی كردووین ، و فەرموویەتی : " اتقوا الحديث عني إلا ما علمتم " [٨] ، جا ئەگەر پەیامبەری خوا ﷺ گێڕانەوەی قەدەغە كردبێت ، ئەوا لەپێشترە كە كردەوە پێكردنی قەدەغە بكات .

ئەمە و ئەم پەرتوكەم لەسەر دوو بەش دانابوو ، سەر و بن ، سەبارەت بە یەكەمیان وەكو ناوەڕۆك بوو ، تێیدا ناوەڕۆكی ئەو فەرموودانەم هێنابوو یان ئەو بڕگە و ڕستانەی كە پێویستە لێیان ، لەگەڵ دانانی لە شوێنی شایستە و شیاوی خۆی بە شێوەیەكی ئەوتۆی گونجاو كە لەگەڵ یەكدا بگونجێن ، بۆ ئەوەی بە شێوەیەكی گونجاو لە گەڵ یەكدا دەربكەوێت لەسەرەتاوە تاكو كۆتایی ، هەوڵی ئەوەشم داوە كە دەقی فەرموودەكە ، یان ئەو گـ ( لفظ ) ـوێیەی كە لە پەرتوكەكانی سوننەتدا هاتووە ، لەوانەشە فەرموودەی وا هەبێت چەند گۆیەكی هەبێت ، بەڵام من گۆیەكی تایبەتیان هەڵبژێرم بە پێشتری بزانم لە بەر سوودێكی نووسینەكەم ، یان جگە لەوە ، لەوانەشە گۆیەكی تری بدەمە پاڵ

---

[٧] البخاري ومسلم ، وهو مخرج في كتابي : ( غاية المرام تخريج الحلال والحرام ، برقم : ٤١٢ ) .

[٨] صحيح : أخرجه الترمذي وأحمد وابن أبي شيبة ، وعزاه الشيخ محمد سعيد الحلبي في ( مسلسلاته : ١ / ٢ ) للبخاري فوهم .

ثم تبين لي أن الحديث ضعيف ، وكنت اتبعت المناوي في تصحيحه لإسناد ابن أبي شيبة فيه ، ثم تيسر لي الوقوف عليه ، فإذا هو بَيِّنُ الضعف ، وهو نفس إسناد الترمذي وغيره ، راجع كتابي ( سلسلة الأحاديث الضعيفة : ١٧٨٣ ) ، وقد يقوم مقامه قوله ﷺ : " من حدث عني بحديث يرى أنه كذب فهو أحد الكذابين " ( رواه مسلم وغيره ، راجع مقدمة كتابي ( سلسلة الأحاديث الضعيفة : المجلد الأول ) .

بل يغني عنه قوله ﷺ : " إياكم وكثرة الحديث عني ، من قال علي فلا يقولن إلا حقا أو صدقا ، فمن قال علي ما لم أقل فليتبوأ مقعده من النار " ( أخرجه ابن أبي شيبة ( ٨/٧٦٠ ) وأحمد وغيرهما وهو مخرج في : ( الصحيحة ، برقم : ١٧٥٣ ) .

ئاماژەش دەکەم بۆ ئەو شتە بە وەی کە دەڵێم : ( وفي لفظ : كذا وكذا ) یان ( وفي رواية كذا وكذا ) و نایشیدەم پاڵ گێڕەرەوەکەی لە هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ زۆر بە کەمی نەبێت ، وە ئەوەش دیاری ناکەم کە کێ لە پێشەوایانی فەرموودە گێڕاویانەتەوە ، ئـەوەش بۆ ئاسنکاری خوێندنەوە و پیاداچوونەوەی .

وە سەبارەت بە بەشەکەی تریان وەکـو باسـکردنی ئـەوەی پێـشیەتی ، تێیـدا ئـەو فەرموودانەم ( تخريج ) کردووە کە لە بەشی سەرەوەدا هاتوون ، لە گەڵ بـە دواداچـوونی هەموو گۆ و ڕێگەکانیان ، لە گەڵ حوکمدان بە سەر سەنەدەکانیان و ئـەو ڕیوایەتانـەش کە پاڵپشتیان دەکەن ( واتە : الشواهد ) لە لایەنی ( تعديل و تجريح ) و ( تـصحيح و تضعيف ) یشەوە ، بەو پێیەی کە لەزانستی فەرموودەناسی پیرۆز وبنەواکانیدا هاتووە .

وە زۆرجاریش لە هەندێك لەو ڕێگەیانەوە ، گۆ و زیادەیەك هەیـە ، لـە ڕێگـەکانی تریدا نیە ، منیش ئەوانە دەخەمـە سـەر ئـەو فەرموودەیـەی کـە لـە بەشـی سـەرەوەی پەرتوکەکەدا هاتووە ، ئەگەر بکرێت لـە گـەڵ بنەواکەیـدا بگونجێنرێـت ، وە ئاماژەشـم کردووە بۆ ئەو شتە بە دانانی لە نێوان دوو کەوانەی لاکێشەیی [ ] ، بێ ئـەوەی ئامـاژە بکەم بە ناوی ئەو کەسـەی کـە تـاکڕەوێتی پێکـردووە لـەو کەسـانەی کـە بنەواکـەیان گێڕاوەتەوە ، ئەمە لە کاتێکدایە ئەگەر سەرچـاوەی فەرموودەکـە و بنەواکـەی لـە یـەك هاوەڵەوە بێت ، ئەگینا وەکو فەرموودەیەکی سەربەخۆ مامەڵەم لەگەڵدا کـردووە ، هـەر وەکو بەرچاو دەکەوێت لە پاڕانەوەکانی دەست پێکردنی نوێژ ، و جگە لەوانیش ، ئەمەش شتێکی زۆر نایاب ودەگمەنە ، بەشێوەیەك نزیکە لەوەی کە نەیبینیت لەپەرتوکێکی تردا ، شوکر بۆ ئەو پەروەردگارەی کە بەنیعمەتەکانی چاکەکاریەکان تەواو وکامڵ دەبن .

شاشان پیایدا بۆچوونی زانایان باسم کردوە دەکەم سەبارەت بەو فەرموودەیـەی کـە گێڕاومەتەوە ، لە گەڵ بەڵگەی هەریەکێکیان ، و تاووتوێ کردن وباسکردنی ئەو ووتانەی کە پاڵپشتیان دەکات ، و ئەو ووتانەش کە لەسەریانە ، پاشان ووتـەی ڕەوا لـەو ووتانـە ئاشکرا و دیاری دەکەین کە لەبەشی سەرەوەدا باسمان کردوون ، لەوانەشـە هەنـدێك جـار

هەندێك باسی تیادا بهێنمەوە کە بەڵگەیان لەسەر نیە ، بەڵکو تەنها بۆچونی موجتەهیدەکەیە تێیدا ، ناڕواتە ناو بابەتی ئەم پەرتوکەماندا .

وە لە بەر ئەوەی چاپکردنی پەرتوکەکە بە هەردوو بەشەکەیەوە ئاسان نەبوو بۆمان ـ لە بەر چەند هۆکارێکی بەهێز ـ ئەوەمان بە باش زانی کە بەشی یەکەمی بە سەربەخۆیی لە بەشەکەی تری چاپ بکەین ـ بە پشتیوانی خوای پەروەردگار ـ و ناویشم لێنا : (( **صفة صلاة النبي ﷺ من التكبير إلى التسليم كأنك تراه** )) .

داواکارم لە خوای پەروەردگار کردەوەیەکی پاك بێت ، و تەنها لە بەر ڕەزامەندی ئەو نووسرا بێت ، سوودیش بە بڕوادارانی براشم بگەیەنێت ، هەر ئەویشە بیسەری ڕەها وجوابدەرەوەی پاڕانەوەکان .

# پەیڕەوەی ئەم پەرتوکە

وە لە کاتێکدا بابەتی ئەم پەرتوکە ئاشکراکردنی سوننەتی پەیامبەری خوایە ﷺ لە نوێژدا ، شتێکی بەڵگە نەویستی تێیدا پابەند نەبم بە مەزهەبێکی دیاریکراوەوە ، لە بەر ئەو هۆکارەی کە پێش کەمێك باسمان لێوەکرد ، بەڵکو ئەوەی تێدا باس دەکەم کە جێگیر و سەلمێنراوە لە پەیامبەری خواوە ﷺ هەروەکو بۆچونی فەرموودەناسان ـ لە کۆن و تازەشدا ـ چۆن بووە ، وە ووتەیەکی باشیشی ووتووە ئەو کەسەی کە فەرموویەتی * :

أهلُ الحَديثِ هُمُ أهلُ النَّبي وَإن     لَمْ يَصحبوا نَفسَهُ أنفاسَهُ صَحِبوا

لە بەر ئەوە ـ إن شاء الله تعالى ـ ئەم پەرتوکە کۆکەرەوەی هەموو ئەو فەرموودانەی کە بڵاو و پەرتەوازەن لە ناو پەرتوکەکانی فیقهـو شـەریعەت و فـەرموودەدا ـ سـەرەڕای هەموو ئەو جیاوازی و خیلافـەی کـە لـە نێـوان مەزهـەب و بۆچـوونەکاندا هەیـە کـە پەیوەندیان بە بابەتەکەوە هەیە ـ لە کاتێکدا هـیچ لـەو پەرتوکانـەی ئـەو مەزهەبانـە هەموو ڕەوایی نەگرتۆتە خۆی ، وە ـ إن شاء الله ـ ئەو کەسەش کە پێـی هەسـتێت لـەو کەسانە دەبێت کە خوای پەروەردگار بە توانای خۆی هیدایەتی داوە ﴿ لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ وَاللَّهُ يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ واتە : بۆ ڕەوایی لەو شتانەی کە تێیدا جیاوازن ، پەروەردگاریش وویستی لەسەر هەر کەسێك ببێت ڕێنموویی دەکات بۆ ڕێگای ڕاست .

پاشان من کە ئەو پەیڕەوەم بۆ خۆم داناوە ـ کە بریتی یە لە پابەند بوون دەستگرتن بە سوننەتی ( صحیح ) ـی پەیامبەری خواوە ﷺ ـ وە لە پەرتوکەدا و جگـە لـەمیش پیادەم کردووە ـ کە بە پشتیوانی خـوای پـەروەردگار لـە نـاو خەڵکـدا بـڵاو دەبێتـەوە ـ دەمزانی و دڵنیا بووم لەوەی کە ئەوە هەموو گرووپ و تایفە و مەزهەبەکان قایل ناکات ، بەڵکو هەندێك ، یان زۆریان زمانی توانج و تانە ، و پێنووسی لۆمەکاریم تێدەکـەن ، ئەوەش هیچ کاریگەریەکەم تێناکات ، چونکە من ئەوەش دەزانم کـە ڕازیکردنـی خـەڵك

* من إنشاد الحسن بن محمد النسوي ؛ كما رواه الحافظ ضياء الدين المقدسي في جزء له في ( فضل الحديث وأهله ) .

مەبەستێکە هەرگیز بەدی نایەت ، و پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " من أرضى الناس بسخط الله وكله الله إلى الناس " [٩] ، واتە : هەر کەسێك بە تووڕەکردنی خوای پەروەردگار خەڵکی لە خۆی ڕازی بکات ، ئەوا خوای پەروەردگار دەیدات بە دەست خەڵکەوە ، ڕەواشی فەرمووە ئەو کەسەی کە فەرموویەتی :

وَلَسْتُ بِنَاجٍ مِن مَقَالةِ طَاعِنٍ وَلَوكُنْتُ فِي غَارٍ عَلَى جَبَلٍ وَعْرِ
وَمَنْ ذَا الذي يَنْجُو مِن النَّاسِ سَالِمَاً وَلَو غَابَ عَنْهم بَيْن خَافِيَتَي نسرِ

ئەوەشم بە کە بیروباوەڕم وای ئەو ڕێگەیە ڕاست و ڕەواترین ڕێگەیە ، کە خوای پەروەردگار فەرمانی بە بڕواداران پێکردووە ، پەیامبەرەکەشمان محمد سەروەری پەیامبەران ﷺ ئاشکرا و ڕوونی کردووەتەوە ، هەر ئەو ڕێگەیەشە کە پێشین و سەلەفی صاڵحی ئەم ئوممەتە لە هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان پاش خۆیان گرتوویانەتە بەر لەوانەش پێشەوای هەر چوار مەزهەبەکە - کە زۆرینەی موسڵمانان دەدرێنە پاڵیان - هەموشیان هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە پێویستە دەست بگیرێت بە سوننەتەکانی پەیامبەری خواوە ﷺ ، گەڕانەوە بۆ لای سوننەت ، لە گەڵ وازهێنان لە هەموو ووتەیەك کە پێچەوانەی بێت ، با بێژەرەکەی هەرچەندە گەورە بێت ، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ زۆر لەوان گەورەتر و بەڕێزترە ، ڕێبازەکەشی ڕاست و ڕەواترە ، لە بەر ئەوە شوێنی ڕێبازی ئەوان کەوتووم ، و شوێنەواری ئەوانیشم هەڵگرتووە ، و شوێنی فەرمانەکانیان کەوتووم کە فەرمانیان کردووە بە دەستگرتن بە فەرموودەکانی پەیامبەری خوا ﷺ با پێچەوانەی ووتەی خۆیشیان بێت ، ئەم ووتانەشیان گەورەترین کاریگەری هەبووە لەسەر گرتنە بەری ئەم پەیڕەوە ڕێك و ڕاستە ، لەگەڵ دورکەتنەوە و پشت کردنم لە لاسای و لاسایی کردنەوەی کوێرانە ، داواکارم لە خوای پەروەردگار پاداشتی خێریان بداتەوە .

[٩] صحيح : ( الصحيحة : ٢٣١١ ) .

## ووتەی پێشەوایان سەبارەت بە شوێنکەوتنی سوننەت و وازهێنان لەو ووتانەیان کە پێچەوانەی سوننەتە

لەو شتانەی کە سوود بەخشە لێرەدا باس بکرێت ئەو ووتانەیانە کە بەرچاومان کەوتوون ، یان هەندێکیان ، بەڵکو ببێتە مایەی ئامۆژگاری و بیرخستنەوە بۆ ئەو کەسانەی کە پابەندن پێیانەوە ـ بەڵکو پابەندێکی کوێرانەی لەوانیش نزمترە ـ و دەست دەگرن بەبۆچوون ومەزهەب و ووتەکانیان هەروەکو بڵێیت لەئاسمان دابەزێنراوەتە خوارەوە ، خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی : ﴿ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾ [١٠] ، واتە : شوێنی ئەو پەرتوکە بکەون کە لەلایەن خوای پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێنراوە ، بۆ ئەوەی بەباشترین شێوە پەروەردە بن ، باشترین رەوشت وکردار ئەنجام بدەن ، و شوێنی هەوا وئارەزووی هیچ کەسێك نەکەون ، و واز لە رەوایی بهێنن ، زۆر کەمیش بیر لەوە دەکەنەوە کە ئەنجامی دەدەن ، چونکە ئەگەر بیرتان لەوە بکردایەتەوە ، وازتان لەرەوایی چاکەکاران نەدەهێنا بۆ شتی خراپ وگومراکاران .

### ١ ـ پێشەوا ( أبو حنيفة ) ـ بە رەحمەت بێت ـ :

یەکەمیان پێشەوا ( أبو حنيفة ) نوعمانی کوڕی ( ثابت ) ـە ـ بە رەحمەت بێت ـ کە هاوەڵانی چەندەها ووتەی زۆر و بابەتی هەمەجۆری لێ دەگێرنەوە ، هەمووی لە ئاکامدا یەك مەبەست دەپێکن ئەویش : پێویستی وەرگرتنی فەرمودە و وازهێنان لە لاسایی کردنەوەی ئەو ووتانەی کە پێشەوایان پێچەوانەین :

١ ـ ئەبو حەنیفە ـ بەرەحمەت بێت ـ فەرموویەتی : " إذا صحَّ الحديث فهو مذهبي " [١١] ، واتە : ئەگەر فەرموودەیەك جێگیر و سەلمێنرا ئەوا مەزهەبی منە .

---

[١٠] الأعراف : ٣ .

[١١] ابن عابدين في : ( الحاشية : ١ / ٦٣ ) .

٢ ـ وە فەرموویەتی : " لا يحل لأحد أن يأخذ بقولنا ما لم يعلم من أين أخـذناه " [١٢] ، واتە : حەڵاڵ و ڕەوا نیە بۆ هیچ کەسێك ، ووتەی ئێمە وەرگرێت ، ئەگەر نـەزانێت لە کوێوە وەرمانگرتووە .

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : " حرام على من لم يعرف دليلي أن يفتي بكلامي " ، واتە : حەرام و قەدەکراوە لەسەر ئەو کەسەی کە نازانێت بەڵگەی ووتەکـەم چـی یـە و فەتوای پێبدات .

وە زیـاد لـەسـەر ئەوەش فەرمـوویەتی : " فإننا بشر نقـول القـول اليوم ونرجع عنه غـدا " ، واتـە : چونکە ئێمـەش مرۆڤین ، ئەمـڕۆ ووتـەیەك دەڵـێین و سـبەینێ لێی پەشیمـان دەبینەوە .

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : " ويحك يا يعقوب ( هو أبو يوسف ) لا تكتب كل ما تسمع مني ؛ فإني قد أرى الرأي اليوم وأتركه غدا وأرى الرأي غدا وأتركه بعد غد " ، واتە : وەی بە حاڵت ئەی یەعقوب ( واتە : أبو يوسف ) هەموو شـتێك کـە لـە منـەوە دەیبیستی مـەینووسە ، چونکە لەوانەیە من ئەمڕۆ ووتەیەك بە چـاك بـزانم ، و سـبەینێ وازی لێبێنم ، و سبەینێ ووتەیەك بە چاك بزانم ، و پاش سبەینێ وازی لێبێنم .

٣ ـ وە فەرموویەتی : " إذا قلت قولا يخالف كتاب الله تعالى ، وخبر الرسول ﷺ ، فاتركوا قولي " [١٣] ، واتە : ئەگـەر ووتەیـەکم ووت پێـچەوانەی قورئانەکـەی خـوای پەروەردگار و سوننەتەکانی پەیامبەر بوو ﷺ ، ئەوا واز لە ووتەکەی من بێنن .

**٢ ـ پێشەوا مالکی کوڕی ئەنەس ـ بە ڕەحمەت بێت ـ :**

وە پێشەوا مالکی کوڕی ئەنەس ـ بە ڕەحمەت بێت ـ فەرموویەتی :

١ ـ : " إنما أنا بشر أخطيء و أصيب ، فانظروا في رأيي : فكل ما وافق الكتـاب والسنة فخذوه وكل ما لم وافق الكتاب والسنة فاتركوه " [١٤] ، واتە : منیش وەکو ئێـوە

---

[١٢] ابن عابدين في : ( حاشيته على البحر الرائق : ٦ / ٢٩٣ ) .

[١٣] الفلاني في : ( الإيقاظ : ص ٥٠ ) .

مرۆڤم هەڵەش دەکەم و دەیشی پێکم ، بۆیە بڕواننە ووتەکانم ، هەرکامەیان هاودەنگ بوو لە گەڵ قورئانی پیرۆز و سوننەتدا ئەوا وەری بگرن ، وە ئەگەر پێچەوانەی قورئانی پیرۆز و سوننەت بوو ئەوا پشت گوێی بخەن .

٢ ـ وە فەرموویەتی : " ليس أحد بعد النبي ﷺ إلا ويؤخذ من قوله ويترك ، إلا النبي ﷺ " [١٥] ، واتە : هیچ کەسێك نیە لە پاش پەیامبەری خوا ﷺ ئیللا لە ووتەکانی وەردەگیرێت ، و وازیش لەهەندێکی دەهێنرێت ، جگە لەپەیامبەری خوا ﷺ .

٣ ـ وە ( ابن وهب ) لە مالکەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە بیستوویەتی جارێکیان پیاوێك سەبارەت بە پەنجە خستنە ناو پەنجەکانی پێ لە دەستنوێژ ، پرسیار لە مالك دەکات ؟ ئەویش فەرمووی : ئەوە لەسەر خەڵك نیە .

دەفەرمێت : منیش وازم لێهێنا تاکو خەڵکەکە سووك بووەوە ، و پێم ووت : سەبارەت بەو شتە فەرموودەمان هەیە ، ئەویش فەرمووی : ئەو فەرموودەیە کامەیە ؟ ووتم : حدثنا الليث بن سعد وابن لهيعة وعمرو بن الحارث عن يزيد بن عمرو المعافري عن أبي عبدالرحمن الحنبلي عن المستورد بن شداد القرشي قال : رأيت رسول الله ﷺ يدلك بخنصره ما بين أصابع رجليه .... واتە : پەیامبەری خوام ﷺ بینیی پەنجە تووتەی دەخستە نێوان پەنجەکانی پێی لەکاتی دەستنوێژدا .

ئەویش ـ واتە : پێشەوا مالك ـ فەرمووی : " إن هذا الحديث حسن وما سمعت به قط إلا الساعة " ، واتە : ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی چاکە ، هەرگیز نەمبیستووە ئێستا نەبێت ... دەفەرموێت : پاشان گوێم لێبوو کە پرسیاری لێ دەکرا فەرمانی دەکرد بە پەنجە خستنە ناو پەنجەکانی پێ [١٦] .

---

[١٤] ابن عبد البر في : ( الجامع : ٢ / ٣٢ ) .

[١٥] ابن عبد البر في : ( الجامع : ٢ / ٩١ ) .

[١٦] مقدمة الجرح والتعديل ، لابن أبي حاتم : ( ص ٣١ ـ ٣٢ ) .

### ٣ ـ پێشەوا شافعی ـ بە ڕەحمەت بێت ـ :

وە سەبارەت بە پێشەوا شافعی ـ بە ڕەحمەت بێت ـ ووتەیەکی زۆرتر و خۆشتری لێوە دەگێڕنەوە ، و شوین کەوتوانیشی لە شوێن کەوتوانی پێشەوایانی تر زیاتر کردار بەو ووتانە دەکەن ، و بەختەوەرترن ، لەوانەش :

١ ـ فەرموویەتی : " ما من أحد إلا وتذهب عليه سنة لرسول الله ﷺ ، وتعزب عنه ، فمهما قلت من قول أو أصلت من أصل ، فيه عن رسول الله ﷺ لخلاف ما قلت ، فالقول ما قال رسول الله ﷺ ، وهو قولي " [١٧] ، واتە : هیچ کەسێك نیە ئیللا هەندێك لە فەرموودەکانی پەیامبەری خوای ﷺ لێ دەڕوات ، و بێ ئاگا دەبێت لێیان جا با هەر ووتەیەکم ووتبێت ، یان بنەوایەکم تێدا داڕشتبێت ، لە پەیامبەری خواوە ﷺ پێچەوانەی ووتەکەم سەلمێنرا و جێگیر بوو بێت ، ئەوا ووتە ووتەی پەیامبەری خوایە ﷺ ، ئەوەش ووتەی منە .

٢ ـ وە فەرموویەتی : " أجمع المسلمون على أن من استبان له سنة عن رسول الله ﷺ لم يحل له أن يدعها لقول أحد " [١٨] ، واتە : موسڵمانان کۆڕان لەسەر ئەوەی کە ئەگەر موسڵمانێك سوننەتێك لە سوننەتەکانی پەیامبەری خوای ﷺ لە لا جێگیر و ئاشکرا بوو ، ئەوا بۆی حەڵاڵ نیە لەبەر ووتەی هیچ کەسێك وازی لێ بهێنێت .

٣ ـ وە دەفەرموێت : " إذا وجدتم في كتابي خلاف سنة رسول الله ﷺ ، فقولوا بسنة رسول الله ﷺ ، ودعوا ما قلت " ، واتە : ئەگەر لە پەرتوکەکەمدا ووتەیەکتان بینی پێچەوانەی ووتەی پەیامبەری خوا ﷺ بوو ، ئەوا با ووتەتان ووتەی پەیامبەری خوا بێت ﷺ ، و واز لە ووتەی من بهێنن .

---

[١٧] تاريخ دمشق ، لابن عساكر : ( ١٥ / ١ / ٣ ) .

[١٨] ( الفلاني : ص ٦٨ ) .

وه له ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی : " فاتبعوها ، ولا تلتفتوا إلى قول أحد " [١٩] ، واته : ئەوا شوێنی بکەون ، و لا مەکەنەوە بەلای ووتەکەی مندا .

٤ ـ وه فەرموویەتی : " إذا صح الحديث ، فهو مذهبي " [٢٠] ، واته : ئەگەر فەرموودەیەك جێگیر و سەلمێنرا ، ئەوا مەزهەب و بۆچوونی منە .

٥ ـ وه فەرموویەتی : " أنتم أعلم بالحديث والرجال مني ، فإذا كان الحديث الصحيح فأعلموني به ، أي شيء يكون : كوفيا أو بصريا أو شاميا ، حتى أذهب إليه إذا كان صحيحا " [٢١] ، واته : ئێوه له من شارەزا و زاناترن بەفەرموودە و کەسانێ کە فەرموودە دەگێڕنەوە ، بۆیە ئەگەر فەرموودەیەکی ( صحيح ) هەبوو ئەوا پێم بڵێن ، هی هەر لایەك بێت : کوفی بێت یان بەصری یان شامی ، بۆ ئەوەی ئەگەر ( صحيح ) بوو بۆی بڕۆم .

٦ ـ وه دەفەرموێت : " كل مسألة صح فيها الخبر عن رسول الله ﷺ عند أهل النقل ، بخلاف ما قلت ، فأنا راجع عنها ، في حياتي ، وبعد موتي " [٢٢] ، واته : هەر بابەتێك کە لە پەیامبەری خواوە ﷺ ، و لەلای ( أهل الحديث ) ، و فەرموودەناسانەوە فەرموودەی تێدا جێگیر و سەلمێنراو بێت ، بە پێچەوانەی ئەوەی کە من ووتوومە ، ئەوا من لێی دەگەڕێمەوە و پەشیمانم لێی ، لە ژیان و دوای مردنیشم .

٧ ـ وه فەرموویەتی : " إذا رأيتموني أقول قولا ، وقد صح عن النبي ﷺ خلافه ، فاعلموا أن عقلي قد ذهب " [٢٣] ، واته : ئەگەر منتان بینی ووتەیەکم ووت ، لەو لاشەوە بە پێچەوانەی ووتەکەم فەرموودە لە پەیامبەرەوە ﷺ جێگیر و سەلمێنرا بوو ، ئەوا بزانن کە چیری و هۆشم لە دەست داوە .

---

[١٩] النووي في : ( المجموع : ١ / ٦٣ ) .

[٢٠] النووي : ( ١ / ٦٣ ) .

[٢١] الخطيب في : ( الاحتجاج بالشافعي : ٨ / ١ ) .

[٢٢] أبو نعيم في : ( الحلية ٩ / ١٠٧ ) .

[٢٣] رواه ابن عساكر بسند صحيح ( ١٥ / ١٠ / ١ ) .

٨ ـ وە فەرموویەتی : " كل ما قلت فكان عن النبي ﷺ خلاف قولي مما يصح فحديث النبي أولى فلا تقلدوني " [٢٤] ، واتە : هەموو ئەوانەی کە ووتوومە ، و لەو لاشەوە بە پێچەوانەی ووتەکەی منەوە فەرموودە لە پەیامبەرەوە ﷺ هاتبێت ، کە جێگەی ئەوە بێت بە ( صحيح ) دابنرێت ، ئەوا فەرموودەکەی پەیامبەری خوا ﷺ ئەولاترە و لاسایی من مەکەنەوە .

٩ ـ وە فەرموویەتی : " كل حديث عن النبي ﷺ فهو قولي وإن لم تسمعوه مني " [٢٥] ، واتە : هەموو فەرموودەیەك کە لە پەیامبەری خواوە ﷺ جێگیر و سەلمێنراوە ئەوا ووتەی منە ، با لە منیشەوە نەیبیستن .

### ٤ ـ پێشەوا أحمد ی کوڕی حنبل ـ بە ڕەحمەت بێت ـ :

بەڵام سەبارەت بە پێشەوا ( أحمد ) ـی کوڕی ( حنبل ) ـ بە ڕەحمەت بێت ـ ئەوا کۆکەرەوەترین و پابەندترینیانە بە سوننەتەوە ، بە شێوەیەك ( كان يكره وضع الكتب التي تشتمل على التفريع والرأي ) ، بۆیە فەرموویەتی :

١ ـ : " لا تقلدني ، ولا تقلد مالكا ، ولا الشافعي ، ولا الأوزاعي ، ولا الثوري ، و خذ من حيث أخذوا " [٢٦] ، واتە : نە لاسایی من بکەن ، وە نەش لاسایی مالك ، و شافعی ، و ئەوزاعی ، و ( الثوري ) بکەن ، بەڵکو لەو شوێنەوە وەری گرن کە ئەوان وەریان گرتووە .

وە لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی : " لا تقلد دينك أحدا من هؤلاء ، ما جاء عن النبي ﷺ وأصحابه فخذ به ، ثم التابعين ، بعد الرجل فيه مخير " ، واتە : لە دینداریتدا لاسایی هیچ کەسێك لەوانە مەکەوە ، ئەوەی کە لە پەیامبەرەوە ﷺ یان لە هاوەڵاتی جیگر و سەلمێنراوە ، ئەوا وەری بگرە ، پاشان لە شوێنکەوتوانیان ( واتە : التابعين ) ، پاش ئەوان مرۆڤ سەربەخۆیە لە وەرگرتن یان وەرنەگرتنی ووتەی کەسانی تر .

---

[٢٤] رواه ابن عساكر بسند صحيح ( ١٥ / ٩ / ٢ ) .

[٢٥] ابن أبي حاتم : ( ٩٣ ــ ٩٤ ) .

[٢٦] ابن القيم في : ( إعلام الموقعين : ٢ / ٣٠٢ ) .

وە جارێکیان فەرمووی : " الإتبــاع : أن يتبع الرجل ما جـاء عـن الـنبي ﷺ وعـن أصحابه ثم هـو من بعد التابعين مخير " [٢٧] ، واتە : شوێنکەوتن : بریتیە لەوەی کـە مـرۆڤ شوێنی ئەوە بکەوێت کە لە پەیامبەرەوە ﷺ یان لە هاوەڵانیـەوە جێگـر و سـەلمێنراوە ، پاشان لە پاش شـوێنکەوتوانیان ( واتـە : التـابعين ) ، سـەربەخۆیە لـە وەرگـرتن یـان وەرنەگرتنی ووتەی کەسانی تر .

٢ ـ وە فەرموویـەتی : " رأي الأوزاعي ، و رأي مالك ، و رأي أبي حنيفة ، كله رأي ، و هو عندي سواء ، و إنما الحجة في الآثار " [٢٨] ، واتە : ڕا و بۆچوونی ئەوزاعی ، و مالك ، و ئەبو حەنیفە ، هەموو بۆچوونن ، هەموشیان لەلای من وەك یـەکن ، بـەڵام ئـەوەی کـە بکرێت بە بەڵگە تەنها فەرموودەیە .

٣ ـ وە فەرموویـەتی : " من رد حديث رسول الله ﷺ ، فهو على شفا هلكــة " [٢٩] ، واتە : ئەوەی کە فەرموودەی پەیامبەری خوا ﷺ ڕەت بکاتەوە ، لە ناوچوونی نزیکە .

ئەوەیە ووتەی پێشەوایان ﷺ لەفەرمان کردنیان بە دەست گرتن بە فـەرموودەکانی پەیامبەری خوا ﷺ ، و لەگەڵ یاساغی کردنیان لە لاسایی کردنەوەی کوێرانە بـۆ ئـەو زانا پایە بەرزانە بەبێ چاو ڕۆشنی وسەیرکردنی بەڵگـەکانیان ، ئـەو ووتانـەش ئەوەنـدە ڕوون و ئاشکران ، بەهیچ شێوەیەك شوێنی تاوتوێکردن نین ، و هیچ لێکدانەوەیەکی تری پوچەڵیش هەڵناگرن ، بۆیە لەسەر ئەو ووتانە : ئەگەر کەسێك دەست بگرێتە هەموو ئەو فەرموودانەی کە جێگیر وسەلمێنراون لەسوننەتدا ، با پێچەوانەش بێت لەگـەڵ هەنـدێك لەووتەی ئەو پێشەوا بڕێزانە ، ئەوا پێچەوانەی بۆچوونی ئەوان نابێت ، و دەرچـووش نیـە لەڕێگە وڕێبـازی ئـەوان ، بـەڵکو لەڕاسـتیدا ئـەوە بـە شـوێنکەوتوویان دادەنرێـت ، و دەستیشی گرتووە بەپەتی پتەوی ئیسلامەتیەوە ، و هیچ کاتێکیش بچڕاندنی بۆ نیە ، ئەو

---

[٢٧] رواه أبو داود في : ( مسائل الإمام أحمد : ص ٢٧٦ ـــ ٢٧٧ ) .

[٢٨] ابن عبد البر في : ( الجامع ٢ / ١٤٩ ) .

[٢٩] ابن الجوزي في : ( المناقب : ص ١٨٢ ) .

کەسەش کە واز لەسوننەتێك دەهێنێت ـ سەرەڕای سەلماندن و جێگیربوونی ـ تەنها لەبەر ئەوەی کە فەرموودەکە پێچەوانەی ووتەی ئەو پێشەوا بەڕێزانەیە ، ئەوا ئەو کەسە وەکو ئەو کەسەی پێشوو نیە کە دەستی گرتووە بەپەتی پتەوی ئیسلامەتیەوە ، بەڵکو بەو کردارەی سەرپێچی کاریانە وپێچەوانەی ووتە بە نرخەکانیانە ـ کە لەپێشدا باسکران ـ خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی : ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ [٣٠] ، وە فەرموویەتی : ﴿ فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ [٣١] .

پێشەوا ( ابن رجب ) ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ فەرموویەتی : (( فالواجب على كل من بلغه أمر الرسول ﷺ وعرفه أن يبينه للأمة وينصح لهم ويأمرهم باتباع أمره وإن خالف ذلك رأي عظيم من الأمة فإن أمر رسول الله ﷺ أحق أن يعظم ويقتدى به من رأى أي معظم قد خالف أمره في بعض الأشياء خطأ ومن هنا رد الصحابة ومن بعدهم على كل مخالف سنة صحيحة وربما أغلظوا في الرد ، لا بغضا له بل هو محبوب عندهم معظم في نفوسهم لكن رسول الله أحب إليهم وأمره فوق أمر كل مخلوق فإذا تعارض أمر الرسول وأمر غيره فأمر الرسول أولى أن يقدم ويتبع ولا يمنع من ذلك تعظيم من خالف أمره وإن كان مغفورا له بل ذلك المخالف المغفور له لا يكره أن يخالف أمره إذا ظهر أمر الرسول ﷺ بخلافه )) ، واتە : پێویستە لەسەر هەموو کەسێك کە فەرمانی پەیامبەری خوای ﷺ پێبگات ، و بیزانێت ، ڕوونی بکاتەوە بۆ ئوممەت ، و ئامۆژگاریان بکات ، و فەرمانیشیان پێبکات بە شوێنکەوتنی فەرمانەکانی ، با پێچەوانەش بێت بۆ ووتەی هەر گەورەیەکی ئەم ئوممەتە ، چونکە فەرمانی پەیامبەری خوا ﷺ ، لەپێشترە کە بە گەورە دابنرێت و چاوی لێبکرێت ، لە بۆچوونی هەموو کەسێکی بە گەورە دانراوێك کە پێچەوانەی فەرمانی ئەو بوو بێتەوە لە هەندێك لە

---

[٣٠] النساء : ٦٥ .

[٣١] النور : ٦٣ .

بۆچوونەکانیدا ، لەسەر ئەم بنەوایەیە کە هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ ، و ئەوانەش کە بە دوایاندا هاتوون بەرپەرچی هەموو ئەوانەیان داوەتەوە کە پێچەوانەی سوننەتە ( صحیح ) ـەکانی پەیامبەر ﷺ بونەتەوە ، ڕەنگە زۆریش بە توندی ڕەتیان کردبێتەوە ، نەك لە بەر ئەوەی کە ڕقیان لێ بێت ، بەڵکو ئەو کەسانە لە لایاندا خۆشەویست بوونە ، و بەڕێز و گەورەن لە دەروونیاندا ، بەڵام ڕەسول الله خۆشەویست ترە لایان ، و فەرمانیشی لەسەر فەرمانی هەموو درووستکراوێکە ، بۆیە ئەگەر فەرمانی پەیامبەر ﷺ لە گەڵ فەرمانی جگە لەو پێچەوانە بێتەوە ، ئەوا فەرمانی پەیامبەر ﷺ پێشترە لەوەی کە پێش بخرێت ، وشوێن بکەورێت ، ئەوەش ڕێگر نیە لەوەی ئەو پێشەوایەی کە پێچەوانەی بووەتەوە بە گەورە و ڕێزدار دابنرێت ، هەرچەند خوای پەروەردگار لێی خۆش بوو بێت ، بەڵکو ئەو کەسانە پێیان ناخۆش نیە کە پێچەوانەی ووتەکانیان ببیتەوە ئەگەر دەرکەووت کە فەرمانی پەیامبەری خوا ﷺ پێچەوانەی ووتەکەیانە .

**دەڵێم** : چۆن ڕقیان دەبێت لەوە ، لەکاتێکدا ئەو پێشەوا بەڕێزانە خۆیان فەرمانیان بەشوێن کەوتوانیان کردووە ـ هەروەکو لەپێشدا ئاماژەمان پێدان ـ وە ئەوەشیان لەسەر پێویست کردوون کە واز لەو ووتانەیان بهێنن کە پێچەوانەی سوننەتن ؟ بەڵکو پێشەوا شافعی ـ بەڕەحمەت بێت ـ فەرمانی بە شوێنکەوتوانی کردووە کە ئەگەر سوننەتێك سەلمێنرا وجێگیربوو بیدەنە پاڵی ، با لەژیانیشدا ئەو سوننەتەی نەووتبێت ، یان بۆچوونێکی پێچەوانەی ئەو سوننەتەی هەبووبێت ، بۆیە دەبینین کە لێکۆڵەر و پێشەوا ( ابن دقیق العید ) ـ بە ڕەحمەت بێت ـ ئەو بابەتانەی کۆکردەوە کە بۆچوونی چوار پێشەواکە تیایاندا پێچەوانەی فەرموودەی ( صحیح ) ـن ـ دانەیەکیان بێت یان هەموویان ـ ئەوەش لە یەك بەرگی زۆر گەورەدا ، کە لەسەرەتاکەیدا فەرموویەتی : (( إن نسبة هذه المسائل إلى الأئمة المجتهدين حرام ، وإنه يجب على الفقهاء المقلدين لهم معرفتها لئلا يعزوها إليهم فيكذبوا عليهم )) ، واتە : دانی ئەم بابەتانە بۆ پاڵ پێشەوایانی موجتەهید حەرام و قەدەغەن ، وە پێویستە لەسەر لاساییکارانیان دڵنیابن لەو بابەتانە ، بۆ ئەوەی شتێکەنەدە پاڵیان کە نەیانووتبێت ، و بەو کارەشیان دەکەونە درۆدان لەسەر زمانیان .

# وازهێنانی شوێنکەوتوانی چوار مەزهەبەکە لە هەندێك ووتەی پێشەواکانیان ، لەبەر شوێنکەوتنی سوننەت

وە لە بەر هەموو ئەو ووتانەیە دەبینین زۆرینەی شوێن کەوتوانی پێشینی ئەو پێشەوا بەرێزانە ، و هەندێکیش لە پاشینەکانیان ، هەموو ووتەیەکی پێشەواکانیان وەرناگرن ، بەڵکو وازیان لە زۆر لە ووتەکانیان هێناوە ، کە دەیانبینی ئەو ووتانە پێچەوانەی سوننەتن ، بە شێوەیەك دوو پێشەوا : محمدی کوڕی حسن ، و باوکی یوسف ـ ڕەحمەتی خوای پەروەردگاریان لێ بێت ـ پێچەوانەی شێخەکەیان ( أبو حنیفة ) کردووە ( لە نزیکەی سێ یەکی مەزهەبەکەیدا ) ، پەرتوکەکانی فیقهیش کەفیلن بە ئاشکراکردنی ئەو ڕاستیە ، هاوشێوەی ئەمەش دەوترێت سەبارەت بە پێشەوا ( المزني ) و جگە لەویش کە لە شوێنکەوتوانی پێشەوا شافعی و جگە لە ویش ، وە ئەگەر بمانەوێت نموونە لەسەر ئەوە بهێنینەوە ، ئەوە درێژە بە ووتە دەدەین ، وە لەو مەبەستەش دەردەچین کە هەمانە لەم توێژینەوەدا ، کە کورت بڕییە ، بۆیە تەنها دوو نموونە دەهێنینەوە :

١ ـ پێشەوا محمد لە ( موطأ ) ـەکەیدا لە ( پەڕەی : ١٥٨ ) ـدا فەرموویەتی : " قال محمد : أما أبو حنيفة ـ رحمه الله ـ فكان لا يرى في الاستسقاء صلاة ، وأما في قولنا : فإن الإمام يصلي بالناس ركعتين ، ثم يدعو ، ويحول رداءه " ... هتد ، واتە : محمد فەرموویەتی : بەڵام سەبارەت بە پێشەوا ( أبو حنيفة ) ـ بە ڕەحمەت بێت ـ نوێژی بە سوننەت نەدەزانی لە کاتی پاڕانەوە بۆ باران بارین ، بەڵام لە ووتەی ئێمەدا ئەوەیە کە : پێشنوێژ دوو ڕکات نوێژ بەخەڵك دەکات ، پاشان دەپاڕێتەوە وپۆشاك هەڵدەگێڕێتەوە .

٢ ـ وە ( عصام ) ـی کوڕی ( يوسف البلخي ) لە هاوەڵانی پێشەوا ( محمد ) و یەکێك لەوانەی کە زۆر لە گەڵ پێشەوا ( أبو يوسف ) ـدا بووە : (( كان يفتي بخلاف قول الإمام أبي حنيفة كثيرا ، لأنه لم يعلم الدليل وكان يظهر له دليل غيره فيفتي به )) ، واتە : زۆر جار بە پێچەوانەی ووتەی پێشەوا ( أبو حنيفة ) فەتوای دەدا ، چونکە بەڵگەی فەتواکەی نەدەزانی ، جاری واش هەبوو بەڵگەی غەیری ئەوی پێ ئەولاتر بوو بۆیە فەتوای پێ دەدا ،

له بەر ئەوەیە دەبینین : (( كان يرفع يديه عند الركوع ، والرفع منه )) ، واتە : دەستەكانی لەكاتی كڕنووش بردن ، و بەرز بوونەوە لێی بەرز دەكردەوە ، هەروەكو لە سوننەتی ( متواتر ) ـدا لە پەیامبەری خواوە ﷺ جێگیر و سەلمێنراوە ، ئەوەش ڕێگر نەبووە لە كارپێكردنی ، كە سێ پێشەوای بەڕێز بۆچوونیان پێچەوانەی ئەوە بووە ، ئەم ئاكارەش پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك ، ئەوەش بە گەواهی ئەو چوار پێشەوا بەڕێزە و جگە لەوانیش ، هەروەك لە پێشدا باس كرا .

پوختەی ووتەش ئەوەیە كە داواكارم هیچ یەكێك لە شوێنكەوتوانیان تانە و تەشەرە نەدەن لە پەیڕەوی ئەم پەرتوكە و واز لە سوود وەرگرتن نەهێنێت لەو سوننەتانەی پەیامبەری خوا ﷺ كە تێیدا هاتوون ! بە بیانووی ئەوەی كە پێچەوانەی مەزهەبەكەیەتی !! بەڵكو داواكارم ئەو ووتانەی كە باسكراون لە بەر چاو بگرێت كە سەبارەت بە پێویستی كاركردن بە سوننەت و وازهێنان لە ووتەی پێچەوانەیان بۆ سوننەت وتراوە ، وە ئەبێت ئەوەش بزانێت كە تانە و تەشەرەدان لە پەیڕەوی ئەم پەرتوكە تانە و تەشەرەدانە لەو پێشەوایەی كە شوێنكەوتوویەتی ، هەر یەكێك بێت لەو پێشەوا بەڕێزانە ، چونكە ئێمەش ئەو پەیڕەوەمان لەو بەڕێزانەوە وەرگرتووە ، هەر وەكو لە پێشدا باسمان لێوەكرد ، بۆیە هەر كەسێك پشتیان لێ بكات لەم پەیڕەوەیاندا ، ئەوا لە ترسناكیەكی زۆر گەورەدایە ، چونكە ئەوە دەگەیەنێت كە پشت بكرێت لە سوننەت ، لە كاتێكدا خوای پەروەردگار فەرمانی ئەوەی پێكردوین كە لە كاتی جیاوازیماندا بگەڕێینەوە ، و متمانەی بكەینە سەر ، هەروەكو فەرموویەتی : ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ ( النساء : ٦٥ ) .

داواكارم لە خوای پەروەردگار بمانكات لەو كەسانەی كە سەبارەتیان فەرموویەتی : ﴿ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَخْشَ اللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ ﴾ ( النور : ٥١ ــ ٥٢ ) .

دیمەشق : (١٣) ـەی جمادی الآخرة / ساڵی ١٣٧٠ ك

## چەند شوبهەیەك و وەڵامەكانیان

ئەم ووتانە پێش دەساڵ دەبێت لـە پێـشەكی ئـەم پەرتوكـەدا نووسـی بـووم ، لـەم كاتەشدا ئەوەم بۆ دەركەت كە كاریگەریەكی زۆر چاكی هەبووە لە ڕیزی لاوانی بـڕوادارردا ، ئەوەش لە ڕێنموویی كردنیان بۆ پێویستی گەڕانەوە بـۆ ئـاین ، و پەرستـشەكانیان ، و وەرگرتنیان لەسەرچاوە پاك و خاوێنەكەی ئاینی ئیسلامی پیرۆزەوە : كە قورئانی پـیرۆز و سوننەتەكانی پەیامبەری خوایـە ﷺ ـ شـوكر و سـتایش بـۆ خـوای پـەروەردگار ـ زۆر كەسانی كارپێكاری سوننەتیان تێدا درووست بووە ، لە پەرستشەكانیاندا ، بە شـێوەیەك وایان لێ هاتووە بەو شتە بناسرێنەوە ، سەرەڕای ئەوەش من لـە هەندێكیانـدا سـستیەكم بەدی دەكرد لە كارپێكردنیدا ، ئەوەش لە بەر ئەوە نیە كە گومانیان لە پێویستی ئەوەدا هەبێت ـ دوای هێنانەوەی ئەو هـەموو ئایـەت و ووتانـە لـە پێـشەوایان سـەبارەت بـە فەرمانكردنیان بە گەڕانەوە بۆی ـ بەڵكو ئەو سستیە بە هۆی هەندێك شوبهەوەیە كە لە هەندێك لە شێخانی لاسایی كاری مەزهەبەكان !

بۆیە وادەبینم كە باسی ئەو شوبهانە بكەم ، و وەڵامیشیان بدەمـەوە ، بـەڵكو ئـەوە ببێتە هۆی ئەوەی كە ئەو هەندەش هەستن بەكارپێكردن بەسوننەت ، لەگەڵ كارپێكارانی تردا ، بۆ ئەوەی هەموو ـ بە ویستی خوای پەروەردگار ـ بن بەكۆمەڵی ڕزگاربوو .

١ ـ هەندێكیـان دەڵـێن : (( لا شك أن الرجوع إلى هدي نبينا ﷺ في شؤون ديننا أمر واجب لا سيما فيما كان منها عبادة محضة لا مجال للرأي والاجتهاد فيها لأنها توقيفية كالصلاة مثلا ولكننا لا نكاد نسمع أحدا من المشايخ المقلدين يأمر بذلك بـل نجـدهم يقرون الاختلاف ويزعمون أنها توسعة على الأمة ويحتجون على ذلك بحديث ــ طالمـا كرروه في مثل هذه المناسبة رادين به على أنصار السنة ــ : ( اختلاف أمتي رحمة ) فيبدو لنا أن هذا الحديث يخالف المنهج الذي تدعو إليه وألفت كتابك هذا وغيره عليـه فمـا قولك في هذا الحديث ؟ )) ، واتـە : گومـان لـەوەدا نیـە كـە گەڕانـەوە بـۆ سـوننەتی پەیامبەرەكەمان ﷺ لە كار و باری ئاینەكەمان كارێكی پێویستە ، بە تایبەت لەوانەی

کە پەرستشێکی پەتیە ، و جێگەی ئیجتهاد و ڕا دەربڕین نیە ، چونکە بە پێی دەقەکانی شەریعەت دەبێت ، نموونەش : وەکو نوێژ ، بەڵام زۆر بەدەگمەن نەبێت نابیستین شێخانی لاسایی کار فەرمان بەوە بکەن ، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبینین ـ بەگومانی خۆیان ـ جیاوازی بەباش دەزانن و بە فراوانکاری دادەدەن لەسەر ئەم ئوممەت ، ئەو فەرمودەیەش دەکەنە بەڵگە ـ کە زۆرجار دووبارەی دەکەنەوە و بەرپەرچی سەرخەران و پشتیوانانی سوننەتی پێ دەدەنەوە ـ کە ئەویش فەرمودەی : " اختلاف أمتي رحمة !! " ، بۆیە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەم فەرموودەیە پێچەوانەی ئەو پەیڕەوەیە کە گرتومەتە بەر ، و بانگەشەی بۆ دەکەیت ، و ئەم کتێبە و جگە لەمیشت لەسەر داناوە ، جا چی دەڵێیت سەبارەت بەم فەرموودەیە ؟

وەڵامی ئەمانەش لە دوو ڕووەوەیە :

**یەکەم** : ئەوەیە کە فەرموودەکە ( ضعیف ) ـە بە ( صحیح ) دانانرێت ، بەڵکو ( باطل ) ـەو هیچ بنەوایەکی نیە پێشەوا و عەللامە ( السبكي ) فەرموویەتی : (( لم أقف له علی سند صحیح ولا ضعیف ولا موضوع )) ، واتە : لە لێکۆڵینەوەکانمدا هیچ سەنەدێکم بۆ ئەم فەرموودەیە نەبینیوە ، نە ( صحیح ) ، و نە ( ضعیف ) ، بگرە نە ( موضوع ) یش .

منیش دەڵێم : بەڵکو بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە : (( ... اختلاف أصحابي لكم رحمة )) ، و (( أصحابي كالنجوم فبأيهم اقتديتم اهتديتم )) ، و هەردووکیان بە ( صحیح ) دانانرێن ، بەڵکو یەکەمیان ( واه جدا ) ـەو دووەمیشیان ( موضوع ) ـە ، و بە تێر و تەسەلیش لە ( سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة : برقم : ٥٨ و ٥٩ و ٦١ ) باسم لەسەر کردوون .

**دووەم** : فەرموودەکە سەرەڕای ئەوەی کە پێچەوانەیە لە گەڵ قورئانی پیرۆزدا ، چونکە ئەو ئایەتانەی کە لەو بارەیەوە هاتوون ـ واتە سەبارەت بە نەهی کردن لە جیاوازی لە ئایندا ، و بە فەرمان کردن بە یەکبوون تێیدا ـ لەوە ئاشکراترن کە باس

بكرێن ، بەڵام هیچی تێدا نیە كە وەكو نموونە هەندێكیان بهێنینەوە ، خوای پـەروەردگار فەرمووویـەتی : ﴿ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡ ﴾ [٣٤] ، واتـە : نـاكۆكی و دوو بەرەكی مەكەن لە نێوان خۆتاندا ، چونكە دەبێتە هـۆی سـەر نەكـەوتنتان ، و خەبـەر و بۆنی خراپەكەشتان دەڕوات و بڵاو دەبێتەوە .

وە فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ﴾ [٣٥] ، واتە : لە هاوەڵبڕیاردەران مەبەن ئەوانەی كـە ئاینەكـەیان پارچە پارچە و پەرتەوازە كردووە ، و بوونەتە حیـزب و كۆمـەڵی جیـا جیـاوە ، هـەموو كۆمەڵ حزبێكیشیان بەوەی كە هەیەتی خۆشحاڵە و بەختەوەرە .

وە فەرموویەتی : ﴿ وَلَا يَزَالُونَ مُخۡتَلِفِينَ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَۚ ﴾ [٣٦] ، جا ئەگـەر ئەوانـەی كە خوای پەروەردگار ڕەحمیان پێدەكات تەفریقە و جیاوازی ناكەن ، بەڵكو كەسانی ناڕەوا تەفریقەو جیاوازی دەكەن ، جا چۆن ژیری و مێشكێك جیاوازی بە ڕەحمەت دەزانێت ؟!

بەمـەش ئەوە جێگیر بوو و سەلمێنرا كە ئەو فەرموودەیە ( صحيح ) نیە نە لە سەنەد و نە لەدەقی فەرموودەكەدا ، لەو كاتەشدا بە ڕوونی ئاشكرا دەبێت كـە نابێـت بكرێتـە بەهانە و بیانوویەك بۆ وەستان لە كاركردن بە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پەیامبـەر ﷺ كە پێشەوایان فەرمانیان كردووە بە كار پێكردنیان .

٢ ـ وە هەنـدێكی تریـان دەڵـێن : ئەگـەر جیـاوازی و ئیختـیلاف لـە شـەرعدا قەدەغەكراو بێت ، باشە ئێوە چی دەڵێن سەبارەت بە جیاوازی هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ ، و پێشەوایان لە دوای ئەوان ؟! وە ئایا هیچ جیاوازیەك هەیە لە نێـوان ڕاجیـاوازی ئـەوان و ڕاجیاوازی ئەوانەی كە دوای ئەوان هاتوون ؟!

---

[٣٤] الأنفال : ٤٦ .

[٣٥] الروم : ٣١ ــ ٣٢ .

[٣٦] هود : ١١٨ ــ ١١٩ .

وەڵامەکەشی : بەڵێ جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەو دوو ڕاجیاوازیە ، ئەوەش لە دوو شتدا دەردەکەوێت :

**یەکەم :** هۆکاری جیاوازیەکە .

**دووەم :** کاریگەری جیاوازیەکە .

سەبارەت بە جیاوازی هاوەڵان ، ئەوا بە هۆی زەرووڕەتەوە بووە ، و جیاوازیەکی ئاسایی بووە لەوانەوە لە لایەن تێگەیشتنەوە ، نەك ئەوەی کە لە لایەن خۆیانەوە جیاوازیەکە هەڵبژێرن ، هەندێك شتی تریشی بۆ زیاد دەکرێت کە لەسەردەمی ئەواندا بووە ، کە وای خواستووە جیاواز بن و پاشان لە دوای ئەوان نەماوە ، وەکو ئەو جۆرە جیاوازیانەش ناتوانرێت بە تەواوی لێی ڕزگار بین ، وایش ناکات لە ئەنجام دەرانی بەر ئەو سەرزەنشتە بکەون کە لە ئایەتەکانی پێشوودا باسکرا ، یان ئەوانەی کە ئەو واتایەیان هەیە ، چونکە مەرجی ئەو سەرزەنشتەی تێدا نیە ، کە بریتیە لە مەبەست و بەردەوام بوون و واز نەهێنان لێی .

بەڵام ئەو جیاوازیەی کە لەنێوان لاسایی کاراندا بەرپابووە ، زۆربەی جار هیچ بیانوویەکیان نیە لەئەنجامدانیدا ، وە هەندێکیشیان بەڵگەی قورئانی پیرۆز وسوننەتی بۆ ئاشکرابووە ، کە لایەنی مەزهەبەکەی تر دەگرێت کە ئەم نەیگرتووتە بەر ، کەچی وازی لێ دەهێنیت لەبەر هیچ نە ، جگە لەوە نەبێت کە پێچەوانەی مەزهەبەکەی خۆیەتی ، وەکو بڵێیت مەزهەب لەلای ئەو بنەوایە ، یان ئەو ئاینەیە کە ( محمد ) ﷺ پێی هاتووە ، مەزهەب وبۆچوونەکەی تریش ئاینێکی ترە حوکمەکەی نەماوە واتە : ( منسوخ ) ـە .

وە هەندێك لەوانە بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەو بۆچوونانە وا دەبینن ـ لە گەڵ هەموو ئەو جیاوازیەی کە باسمان کرد ـ کە هەموو ئەوانە شەرعی جۆراوجۆرن ، هەروەکو هەندێك لە پاشینەکانیان ئاماژەیان بەوە داوە : هیچ ڕێگرێك نیە لە پێش موسڵمان لەوەی کە هەر یەکێکیانی پێ باش بێت ، و وەریگرێت ، یان واز بێنێت و دوور بکەوێتەوە لەوەی کە ویستی لەسەر نیە ، چونکە هەر هەمووی ئاینە و شەرعە !!! ڕەنگە ئەوانە و

ئەوانیتریش بەڵگە بەوە بێننەوە بۆ ئەوەی لەسەر جیاوازیان بێننەوە بەو فەرموودە پوچەڵەی کە تێیدا هاتووە : " اختلاف أمتي رحمة " ، وە زۆر جاریش لێیانەوە دەبیسین کە بە بەڵگە دەیهێننەوە بۆ ئەو کارەیان ، بەو ووتە و شێوەیەش لێکی دەدەنەوە ، و ئاراستەی دەکەن کە دەڵێن : بۆیە جیاوازی بە ڕەحمەت دادەنرێت ، چونکە فراوانی تێدایە لەسەر ئوممەت ، لە گەڵ ئەوەی کە ئەم لێکدانەوە و ئاراستە کردنە پێچەوانەی ئایەتی ڕاشکاوی قورئانی پیرۆزە ، لە گەڵ ناوەڕۆك و واتای ئەو ووتانەی کە لە پێشدا باسکران ، دەقی ووتەی هەندێکیان لەو بارەیە هاتووە کە ڕەتی دەکاتەوە ...

پێشەوا ( ابن القاسم ) فەرموویەتی : (( سمعت مالكا والليث يقولان في اختلاف أصحاب رسول الله ﷺ : ليس كما قال ناس : ( فيه توسعة ) ليس كذلك إنما هو خطأ وصواب )) [٣٧] ، واتە : گوێم لە پێشەوا ( مالك ) و ( ليث ) بوو سەبارەت بە جیاوازی نێوان هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویانە : بەو شێوەیە نیە کە هەندێك خەڵك دەیڵێن : کە ئەو جیاوازیانە فراونیان تێیدایە ، بەڵکو هەڵەیە یان ڕاستە .

وە ( أشهب ) فەرموویەتی : (( سئل مالك عمن أخذ بحديث حدثه ثقة عن أصحاب رسول الله ﷺ أتراه من ذلك في سعة ؟ فقال : لا والله حتى يصيب الحق ، ما الحق إلا واحد قولان مختلفان يكونان صوابا جميعا ؟ ما الحق والصواب إلا واحد )) [٣٨] ، واتە : پرسیارکرا لە پێشەوا ( مالك ) سەبارەت بە کەسێك کە کەسێکی متمانە پێکراو ( ثقة ) فەرموودەیەکی پێ ڕاگەیاندبێت لە هاوەڵانی پەیامبەری خواوە ﷺ ئایا وا دەبینیت کە لەو کردارەیدا لە فراوانیدایە و ئەوەندەی بەسە ؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی : نەخێر سوێند بێت بە خوا ، تاکو ڕاستی نەپێکێت ، چونکە ڕەوایی و ڕاستی یەکە ، دوو ووتەی جیاواز هەبن و هەردووکیان ڕاست و ڕەوا بن ؟!! ڕاستی و ڕەوایی هەر یەکە .

---

[٣٧] ابن عبدالبر في : ( جامع بيان العلم : ٢ / ٨١ ــ ٨٢ ) .

[٣٨] المصدر السابق : ( ٢ / ٨٢ ــ ٨٨ ــ ٨٩ ) .

وه ( المزني ) هاورێ و هاوەڵی پێشەوا ( الشافعي ) فەرموویەتی : (( وقد اختلف أصحاب رسول الله ﷺ ، خطأ بعضهم بعضا ، ونظر بعضهم في أقاويل بعض وتعقبها ، ولو كان قولهم كله صوابا عندهم ؛ لما فعلوا ذلك .

وغضب عمر بن الخطاب من اختلاف أُبَي بن كعب وابن مسعود في الصلاة في الثوب الواحد ، إذ قال أُبَي : إن الصلاة في الثواب الواحد حسن جميل . وقال ابن مسعود : إنما كان ذلك والثياب قليلة . فخرج عمر مغضبا فقال : اختلف رجلان من أصحاب رسول الله ﷺ ممن ينظر إليه ويؤخذ عنه وقد صدق أُبَي ولم يأل ابن مسعود ولكني لا أسمع أحدا يختلف فيه بعد ما مقامي هذا إلا فعلت به كذا وكذا )) [٣٩] .

هەروەها ( المزني ) فەرموویەتی : (( يقال لمن جوز الاختلاف وزعم أن العالمين إذا اجتهدا في الحادثة فقال أحدهما : حلال والآخر : حرام أن كل واحد منهما في اجتهاده مصيب الحق : أبأصل قلت هذا أم بقياس ؟ فإن قال : بأصل قيل له : كيف يكون أصلا والكتاب ينفي الاختلاف ؟ وإن قلت : بقياس قيل : كيف تكون الأصول تنفي الخلاف ويجوز لك أن تقيس عليها جواز الخلاف ؟ هذا ما لا يجوزه عاقل فضلا عن عالم )) [٤٠] ، واتە : بەو کەسەی کە جیاوازی بە ڕەوا دەزانێت ، و دەڵێت ئەگەر زانایان جیاواز بوون لە ڕووداوێکدا ، و یەکێکیان ووتی : ئەو شتە حەڵاڵە ، و دووەمیان بڵێت : ئەو شتە حەرام و قەدەغەکراوە ، ئەوا هەر دووکیان لە بۆچوونەکەیاندا پێکاویانە ، ئەوا دبێت پێی بووترێت : تۆ ئەم ووتەیەت لەسەر بنەوایەك ووتووە یان بە پێی ( قیاس ) ؟ جا ئەگەر ووتی : لەسەر بنەوایەك ووتوومە ، پێی دەووترێت : چۆن دەبێت بە پێی بنەوایەك ووترابێت لە کاتێکدا قورئانی پیرۆز جیاوازی ڕەت دەکاتەوە ؟ وە ئەگەر ووتی : بە پێی ( قیاس ) ، پێی دەووترێت : چۆن لە کاتێکدا کە بنەواکان جیاوازی ڕەت دەکەنەوە ، کەچی تۆ دێیت

---

[٣٩] المصدر السابق : ( ٢ / ٨٣ ــ ٨٤ ) .

[٤٠] المصدر نفسه : ( ٢ / ٨٩ ) .

جیاوازی لەسەر ( قیاس ) دەکەی !! ئەمە شتێکە هیچ کەسێکی دانا بە باشی نازانێت جا چ جای کەسێکی زانا !!

جا ئەگەر یەکێك ووتی : ئەو ووتەیەی کە تۆ باسی دەکەیت دەڵێت : ڕەوایی هەر یەکەو نابێت بە چەند دانەیەك ، پێچەوانەیە لە گەڵ ئەو ووتەیەی خودی مالك کە لە کتێبی ( المدخل الفقهي : ١ / ٨٩ ) ی ( للأستاذ الزرقا ) ـدا هاتووە : (( ولقد هم أبو جعفر المنصور ثم الرشيد من بعده أن يختارا مذهب الإمام مالك وكتابه ( الموطأ ) قانونا قضائيا للدولة العباسية ، فنهاهما مالك عن ذلك ، وقال : " إن أصحاب رسول الله ﷺ اختلفوا في الفروع وتفرقوا في البلدان وكل مصيب " )) ، واتە : ئەوە نەبوو خەلیفە ( أبو جعفر المنصور ) و پاش ئەویش ( الرشيد ) و یستیان مەزهەبی پێشەوا ( مالك ) و کتێبەکەی کتێبی ( الموطأ ) هەڵبژێرن بۆ ئەوەی ببێتە دستور و ڕێسای دەوڵەتی ( عباس ) ی ، کەچی پێشەوا ( مالك ) ئەوەی لێ قەدەغە کردن و فەرمووی : هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ جیاوازیان هەبووە لە بابەتە فیقهیەکاندا ، و بەوڵاتەکاندا بڵاوەیان لێ کردووە ، و هەمووشیان هەر پێکاویانە .

منیش دەڵێم : ئەم چیرۆکە زانراوە ، و ئاشکرایە لە پێشەوا ( مالك ) ـەوە ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ بەم بڕگەیەی کۆتایی کە تیێدا هاتووە : (( وكل مصيب )) ، ووتەیەکە من هیچ بنەوایەکم بۆ نەدیوە لە هیچێك لەو ڕیوایات و سەرچاوانەی بەر دەستم کەوتوون ، جگە لە ڕیوایەتێك نەبێت کە ( أبو نعيم ) لە ( الحلية : ٦ / ٣٣٢ ) ـدا ڕیوایەتی کردووە ، و ( مقدام ) ی کوڕی ( داود ) ی تێدایە ، و ئەویش یەکێکە لەوانەی کە پێشەوا ( الذهبي ) لە کتێبی ( الضعفاء ) ـدا هێناویەتی ، لە گەڵ ئەوەشدا دەقەکەی بەم شێوەیەیە : (( وكل عند نفسه مصيب )) ، بۆیە بڕگەی (( عند نفسه )) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو بڕگەیەی کە لە ( المدخل ) ـدا هاتووە زیادکراوە ، ئەی چۆن وا نەبێت لەکاتێکدا پێچەوانەیە لە گەڵ ئەوەی کە ( الثقات ) لە پێشەوا ( مالك ) ـەوە گێڕاویانەتەوە کە ڕەوایی یەکە و نابێت چەند دانەیەك بێت ، هەروەکو چۆن لە

پێشدا ڕوونکرایەوە ؟! هەر ئەمەشە کە هەموو پێشەوایانی هاوەڵان ، و شوێنکەوتوانیان ، و چوار پێشەوا موجتەهیدەکە وجگە لەوانیشی لەسەرە .

( ابن عبدالبر ) لە ( ٢ / ٨٨ ) ـدا فەرموویەتی : (( ولو كان الصواب في وجهين متدافعين ما خطأ السلف بعضهم بعضا في اجتهادهم وقضائهم وفتواهم والنظر يأبى أن يكون الشيء وضده صوابا كله ولقد أحسن من قال :

إِثْبَاتُ ضِدَّيْنِ مَعاً فِي حَالِ أَقْبَحُ مَا يَأْتِي مِنَ الْمَحَالِ )) .

واتە : ئەگەر ڕەوایی لە دوو بۆچونی جیاوازدا بوایە ئەوا پێشین هەندێکیان ئەوانی تریانیان لە بۆچون و داد و فەتواکانیاندا بەهەڵە نەدەخستەوە ، ژیریش ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە شتێك و پێچەوانەکەشی هەر ڕاست بێت ، چاکی فەرمووە ئەو کەسەی کە فەرموویەتی : لە ڕاستیدا سەلماندن و جێگیرکردنی دوو شتی دژ یەك لە یەك کاتدا شتێکی نامۆ و قیزەونە .

جا ئەگەر ووترا " ئەگەر ئەوەمان لەلا جێگیر بوو کە ئەم ڕیوایەتە لە پێشەوا ( مالك ) ـەوە نەسەلمێنراوە ، ئەوا بۆچی پێشەوا ( مالك ) ڕازی نەبوو کە خەلیفە ( المنصور ) خەڵکی لەسەر کتێبەکەی ( الموطأ ) کۆبکاتەوە ؟! و وەڵامی نەدایەوە بۆ ئەو کارە ؟!!

ئەوا دەڵێم : باشترین شتێك لە هەموو ڕیوایەتەکان کە چاوم کەوتبێتە سەری ئەو ڕیوایەتەیە کە پێشەوا ( الحافظ ابن كثير ) لە ( شرح اختصار علوم الحديث : ٣١ ) ـدا باسی کردووە کە پێشەوا مالك فەموویەتی : (( إن الناس قد جمعوا واطلعوا على أشياء لم نطلع عليها )) .

وە ئەوەش لە تواوێتی زانست و دادپەروەری پێشەوا مالکە ، هەروەکو پێشەوا ( ابن كثير ) ـ بە ڕەحمەت بێت ـ فەرموویەتی .

بەمەش ئەوە سەلمێنرا کە جیاوازی هەمووی هەر خراپە ، نەك بە ڕەحمەت دابنرێت ، بەڵام هەندێکی مرۆڤی لەسەر لۆمە دەکرێت ، وەکو ئەو کەسانەی کە زۆر دەمارگیرن بۆ

مەزهەبەکان ، و هەندێکی تری خاوەنەکەی لۆمە ناکرێت لەسەری وەکو ئەو جیاوازیەی کە لە نێوان هاوەڵان و شوێنکەوتەکانیان لە پێشەوایانی ئیسلام روویداوە ، خوای پەروەردگار لە کۆمەڵ و زومرەی ئەواندا حەشرمان بکات ، سەرکەوتووشمان بکات بۆ شوێنکەوتنیان .

بەمەش ئەوە ئاشکرا بوو کە جیاوازی نێوان هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ ئەو جیاوازیە نیە کە لە نێوان شوێنکەوتوانی مەزهەبەکاندا هەیە .

پوختەکەشی ئەوەیە : هاوەڵان کە جیاوازی لە نێوانیاندا هەبووە لە بەر زەرووڕەت بووە ، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا ئینکاری جیاوازیان دەکرد ، و ڕایان دەکرد لێی تاکو ڕێگەیەکیان دەست بکەوتایە .

وە سەبارەت بە لاسایی کاران ( المقلدة ) لە گەڵ ئەوەی کە دەتوانن لێ ڕزگار بن ـ ئەگەر لە بەشێکی گەورەشی بێت ـ نە هاو دەگن لە گەڵتدا ، و نەش هەوڵی بۆ دەدەن ، بەڵکو بگرە بەردەوامن لەسەری ، جا چەند جیاوازن ئەو دوو جیاوازیە !!

ئەوە جیاوازیانە لە لایەن هۆکارەوە .

بەڵام جیاوازی لەلایەن ووتە وکردەوەی هاوەڵانەوە ( واتە : الأثر ) : ئەوا روون و ئاشکرا ترە لەخاڵی پێشتر ، ئەوەش بەوەی کە هاوەڵان ﷺ لە ئەو جیاوازیە زانراوەی کە لەنێوانیاندا هەبووە لەبابەتە فیقهیەکاندا ئەوا دەبینین زۆر هەوڵیان داوە کە یەکڕیزی موسڵمانان بەتووندترین وباشترین شێوە بپارێزن ، لەگەڵ دوورگرتن لەهەموو ئەوانەی کە ووتەی موسڵمان پەرتەوازە وجیاواز دەکات ، ڕێزی موسڵمانانیش دەشێوێنێت ، بۆیە دەبینین تیایاندابوو دەنگ بەرزکردنەوەی لەکاتی خوێندنەوەی ( بسم الله ) دا بەڕەوا دەزانی وهەشیانبوو بەڕەوای نەدەزانی ، وە تیایاندابوو دەست بەرزکردنەوەی بە سوننەت دەزانی وهەشبوو بەسوننەتی نەدەزانی ، وە تیایاندابوو دەست پێوەدانی ئافرەتی بە بەتاڵکەرەوەی دەستنوێژ دەزانی ، و هەشبوو بە بەتاڵکەرەوەی نەدەزانی ، لەگەڵ ئەوەشدا

هەموویان لەپاش پێشنوێژێکەوە نوێژیان دەکرد ، هیچیشیان خۆی نەدەگرتەوە لەوەی کە نوێژ لەپاش پێشنوێژێك ئەنجام بدات بە هۆی جیاوازی بۆچوونیانەوە .

بەڵام سەبارەت بە لاسایی کاران جیاوازیان پێچەوانەی ئەوانە بە تەواوی ، هەروەك دەبینین یەکێك لە شوێنەوارەکانی ئەو جیاوازییەیان ئەوەیە کە موسڵمانان جیاوازیان کەوتۆتە نێوان لە گەورەترین بنەوا پاش بنەوای شایەتومان کە نوێژە !!! بۆیە دەبینین هەموویان ڕازی نابن بەوەی کە نوێژ لەدوای پێشنوێژێکەوە بکەن ، بە بیانووی ئەوەی نوێژی پێشنوێژەکە بەتاڵە یان بەلای کەمەوە نوێژکردن بە دوایدا مەکروهە بە نیسبەت پێچەوانە بوونەوەی لە گەڵ مەزهەب و بۆچوونەکەیدا ، ئەوەشمان لێیانەوە بیستووە ، و بینیوە ، هەروەکو جگە لە ئێمەش بینیویەتی ، چۆن ئەو شتە وا نیە لەکاتێکدا دەبینین لە هەندێك لە کتێبە مەزهەبیە ناسراوەکاندا هاتووە کە ئەو جۆرە نوێژکردنە مەکروهە یان پوچەڵە ؟!! هەر لە ئاکامی ئەوەدا بوو کە لە یەك مزگەوتی گەورەدا چوار میحراب درووست دەکرا ، و لە هەر یەکێکیاندا پێشنوێژی مەزهەب و بۆچوونێك ـ یەك لە دوای یەك ـ ئەنجام دەدرا ، و لەولاشەوە خەڵکانێکت دەبینی چاوەڕوانی پێشنوێژی مەزهەبەکەی خۆیان دەکرد ، لە کاتێکدا کە پێشنوێژەکەی تر خەریکی نوێژکردنە بە کۆمەڵێکی تر !!! بەڵکو بگرە لە لای هەندێك لە لاسایی کاران جیاوازیان گەشتووەتە ئەو ڕادەیەی لەوە گەورەترە ، وەك نموونە : هەندێکیان ئەوەیان قەدەغە کردووە کە هاوسەرگیرێتی لە نێوان پیاوێکی حەنەفی مەزهەب و ئافرەتێکی شافعی مەزهەبدا ڕوو بدات !!! پاشان فەتوای ئەوە لە لایەن هەندێك لە ناسراوەکانیانەوە دراوە ـ کە بە موفتی جنۆکە و مرۆڤیش ( مفتي الثقلين ) ناسراوە ـ کە ئەو هاوسەرگیریە دەبێت لە نێوان لە نێوان پیاوێکی حەنەفی مەزهەب و ئافرەتێکی شافعی مەزهەبدا ڕوو بدات ، بە بەڵگەی ئەوەی کە ووتوویەتی : (( تنزيلا لها منزلة أهل الكتاب )) ، واتە : بەو شێوەیە حیسابی بۆ بکرێت کە حیساب بۆ ئافرەتی خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان ( واتە : أهل الكتاب ) دەکرێت !!! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ـ یان کتێبە باوەڕپێکراوەکانیان ئەوە دەگەیەنن ـ کە پێچەوانەکەی نابێت

ـ کە بریتی یە لە هاوسەرگیری نێوان ئافرەتێکی حەنەفی مەزهەب لە گەڵ پیاوێکی شافعی مەزهەب ـ هەروەکو چۆن نابێت کە ئافرەتی موسڵمان بدرێت بە پیاوێکی خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان !!!

ئەمە دوو نمونەیە لەو نموونە زۆرانەی کە هەن ، شوێنەواری ئەو جیاوازیە ئاشکرا دەکەن بۆ هەموو خاوەن هزرێك کە ئاکامی جیاوازی پاشینان و جەخت کردنیانە لەسەری ، بە پێچەوانەی ئەو جیاوازیەی کە لە نێوان پێشیندا هەبووە ، کە هیچ شوێنەوارێکی خراپی نەبووە لەسەر ئوممەتی ئیسلام ، ئەوەش ڕزگاری کردوون لەوەی کە ئەو ئایەتانە بیانگرێتەوە کە نەهی دەکات لە جیاوازی لە ئایندا ـ بە پێچەوانەی پاشینان ـ خوای پەروەردگار هەمووان ڕێنموویی بکات بۆ ڕێگای ڕاست .

خۆزگە ئەو جیاوازیانەیان کە باسمان لێوەکرد زیانی تایبەت بوایە بە نێوان خۆیانەوە ، نەگەشتایە کەسانی تر لە ئوممەتی ئیسلامی ـ ئەو کاتە کێشەکە سوکتر دەبوو ـ بەڵام بە داخەوە ئەوە وای لێ هاتووە کو تێپەڕ ببێت لێیان بۆ بێ باوەڕانیش لە زۆرێك لە وڵاتاندا ، بەوەش بوونەتە هۆ ڕێگرتن ـ واتە بە هۆی جیاوازیانەوە ـ لەوەی کە کۆمەڵ کۆمەڵ بێنە ناو ئاینەکەی خوای پەروەردگارەوە ، لە کتێبی ( ظلام من الغرب : ٢٠٠ ) ـدا کە لە نووسینی ( محمد الغزالي ) یە ووتەیەك هاتووە کە ئەمە دەقەکەیەتی :

(( حدث في المؤتمر الذي عقد في جامعة ( برينستون ) بأمريكا أن أثار أحد المتحدثين سؤالا ــ كثيرا ما يثار في أوساط المستشرقين والمتهمين بالنواحي الإسلامية ــ قال : " بأي التعاليم يتقدم المسلمون إلى العالم ليحددوا الإسلام الذي يدعون إليه ؟ أبتعاليم الإسلام كما يفهمها السنيون ؟ أم بالتعاليم التي يفهمها الشيعة من إمامية أو زيدية ؟ ثم إن كلا من هؤلاء وأولئك مختلفون فيما بينهم .

وقد يفكر فريق منهم في مسألة ما تفكيرا تقدميا محدودا بينما يفكر آخرون تفكيرا قديما متزمتا )) ، واتە : لەو کۆنگرەیەی کە لە زانکۆی ( برینستون ) لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بەسترا ، یەکێك لە ئامادەبووان پرسیارێکی ورووژاند ـ

کەزۆر جار لە ناوەندە ڕۆژهەڵات ناسیەکاندا ، یان لەو ناوەندانەی کە بایەخ دەدەن بە لایەنە ئیسلامیەکان ـ تێیدا ووتی : بە چ پەیڕەو و زانستێکەوە موسڵمانان دێنە پێشەوە بۆ جیهان بۆ ئەوەی سنووری ئەو ئیسلامەیان دیاری بکەن کە بانگەشەی بۆ دەکەون ؟ ئایا بەو پەیڕەو و زانستەی ئیسلام کە سوننیەکان پەیڕەوی دەکەن و لێی تێ دەگەن ؟ یان بەوەی کە شیعەی دوانزە ئیمامی یان شیعە زەیدیەکان لێی تێ دەگەن ؟ لە گەڵ ئەوەشدا ئەوانەش لە نێوان خۆیاندا جیاوازن .

ڕەنگە کۆمەڵێکیان لە بابەتێکدا بیرکردنەوەیەکی پێشکەوتوو خوازانە بیر بکاتەوە لە سنورێکی دیاری کراودا ، کەچی کۆمەڵانێکی تریان بە بیرکردنەوەیەکی کۆنە ، و ووشك بیر دەکەنەوە .

پوختەکەشی ئەوەیە کە : بانگەوازکاران ئەو کەسانە دەخەنە سەرگەردانیەوە کە بانگەشیان دەکەن بۆ ئیسلام ، چونکە خۆیان لەسەرگەردانیدا دەژین !!!

( محمد سلطان المعصومي ) یش بە ڕەحمەت بێت دەفەرموێت : (( إنه كان ورد علي سؤال من مسلمي بلاد جابان ( يعني اليابان ) من بلدة ( طوكيو ) و ( أوصاكا ) في الشرق الأقصى حاصله : ما حقيقة دين الإسلام ؟ ثم ما معنى المذهب ؟ وهل يلزم من تشرف بدين الإسلام أن يتمذهب على أحد المذاهب الأربعة ؟ أي : أن يكون مالكيا أو حنفيا أو شافعيا أو غيرها أو لا يلزم ؟

لأنه قد وقع هنا اختلاف عظيم ونزاع وخيم حينما أراد عدة أنفار من متنوري الأفكار من رجال ( يابونيا ) أن يدخلوا في دين الإسلام ويتشرفوا بشرف الإيمان فعرضوا ذلك على جمعية المسلمين الكائنة في ( طوكيو ) فقال جمع من أهل الهند : ينبغي أن يختاروا مذهب الإمام أبي حنيفة لأنه سراج الأمة .

وقال جمع من أهل إندونيسيا ( جاوا ) : يلزم أن يكون شافعيا فلما سمع الجابانيون كلامهم تعجبوا جدا وتحيروا فيما قصدوا ، وصارت مسألة المذاهب سدا في سبيل إسلامهم )) .

٣ ـ وە هەندێکی تریان گومانیان وایە دەڵێن : کەواتە ئەوەی کە ئێوە بانگەشەی بۆ دەکەن لە شوێنکەوتنی سوننەت و وەرنەگرتنی ووتەی پێشەوایان ـ ئەگەر پێچەوانەی بوو ـ ئەوە دەگەیەنێت کە پێتان وایە بەتەواوی وەرهایی ووتەیان وەرنەگیرێت ، لە گەڵ سوود وەرنەگرتن لە ئیجتهادات و بۆچونەکانیان !!

منیش دەڵێم : ئەم گومانە لە هەموو شتێك دوورترە لە ڕاستیەوە ، بەڵکو گومانێکی پوچەڵی ئاشکرایە ، هەروەکو زۆر بەئاشکرایی دیارە لە ووتەکانی پێشووتردا ، چونکە هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەر پێچەوانەکەی ئەو گومانە ، بەڵکو هەموو ئەوەی کە ئێمە بانگەشەی بۆ دەکەین تەنها بریتی یە لەوەی کە موسڵمانان واز بهێنن و ئەو مەزهەبانە نەکرێنە ئاین و لە جێگەی قورئان و سوننەتدا دابنرێن ، بە شێوەیەك لە کاتی جیاوازیدا گەڕانەوە بۆ لای ئەوان بێت !!! یان لەو کاتەی ویستمان بۆ بابەتە نوێکانی سەردەم حوکمێکی شەرعی وەرگرین !! هەروەکو چۆن بە ناو شەرع زانان لەم سەردەمەدا دەیکەن ، و لەسەر ئەوە ئەحکامە نوێکانیان داناوە سەبارەت بە بوارەکانی ( الأحوال الشخصية ) و هاوسەرگیری و تەڵاق و جگە لەوانیش ، بێ ئەوەی تێیدا بگەڕێنەوە بۆ قورئانی پیرۆز و سوننەت ، بۆ ئەوەی ڕاست و هەڵەیان بزانن ، یان ڕەوا و ناڕەوایان بزانن ، بەڵام دانانەکانیان لەسەر ڕێگەی (( اختلافهم رحمة )) ، واتە : جیاوازیان میهرەبانیە ، یان بە شوێنکەوتنی هەڵەی زانایان ( تتبع الرخص ) و ئاسانکاری ( التيسير ) و بەرژەوەندیەکان ( المصالح ) ـ بە پێی گومانی خۆیان ـ چەند جوانە ووتەکەی ( سليمان التيمي ) ـی ـ بە ڕەحمەت بێت ـ کە فەرموویەتی : (( إن أخذت برخصة كل عالم اجتمع فيك الشر كله )) ( رواه ابن عبدالبر :٢ /٩١ ــ ٩٢ ) ، وقال عقبة : ( هذا إجماع لا أعلم فيه خلافا )) ، واتە : ئەگەر هەڵەی هەموو زانایەکت وەرگرت ، ئەوا هەموو خراپەیەکت تێدا کۆ دەبێتەوە .

ئەمەیە کە ئێمە ڕەتی دەکەینەوە ، و ئینکاری دەکەین ، وە ئەوەش لەسەروی کۆڕای زانایان و هاودەنگ بوونیانە ، هەروەکو دەبینیت .

بەڵام سەبارەت بە گەڕانەوە بۆ ووتەکانیان و سوود وەرگرتن لێیان ، و پشت بەستن پێیان لە تێگەیشتن و دۆزینەوەی ڕووی درووست تێیدا ، لەو ووتانەی جیاوازن تێیدا لەو بابەتانەی کە هیچ بەڵگەیەکی قورئانی پیرۆز و سوننەتی لەسەر نیە ، یان سەبارەت بەوانەی کە پێویستیان بە ڕوونکردنەوە هەیە ، ئەوە شتێکە ئێمە هیچ نکوڵیەکمان لەسەری نیە ، بەڵکو بگرە فەرمانیشی پێ دەکەین و هانیش دەدەین لەسەری ، چونکە بە دڵنیاییەوە چاوەڕوانی خێری لێ دەکرێت بۆ کەسێك کە ڕێگەی هیدایەتی گرتبێتەبەر بە هۆی قورئانی پیرۆز و سوننەتەوە .

پێشەوا ( ابن عبدالبر ) ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ فەرموویەتی ( ٢/١٧٢ ) :

(( فعليك يا أخي بحفظ الأصول والعناية بها واعلم أن من عني بحفظ السنن والأحكام المنصوصة في القرآن ونظر في أقاويل الفقهاء ـ فجعله عونا له على اجتهاده ومفتاحا لطرائق النظر وتفسيرا لجمل السنن المحتملة للمعاني ـ ولم يقلد أحدا منهم تقليد السنن التي يجب الانقياد إليها على كل حال دون نظر ولم يرح نفسه مما أخذ العلماء به أنفسهم من حفظ السنن وتدبرها واقتدى بها في البحث والتفهم والنظر وشكر لهم سعيهم فيما أفادوه ونبهوا عليه وحمدهم على صوابهم الذي هو أكثر أقوالهم ولم يبرئهم من الزلل كما لم يبرؤوا أنفسهم منه فهذا هو الطالب المتمسك بما عليه السلف الصالح وهو المصيب لحظه والمعاين لرشده والمتبع لسنة نبيه ﷺ وهدي صحابته ﷺ .

ومن أعَفَّ نفسه من النظر وأضرب عما ذكرنا وعارض السنن برأيه ورام أن يردها إلى مبلغ نظره فهو ضال مضل ومن جهل ذلك كله أيضا وتقحم في الفتوى بلا علم فهو أشد عمى وأضل سبيلا )) ، واتە : جا برام پێویستە بنەواکانت لە بەر بێت و بایەخیان پێ بدەیت ، وە ئەوەش بزانە ئەو کەسەی کە بایەخی داوە بە لەبەر کردنی سوننەت و ئەو ئەحکامانەی کە دەقی شەرعیان لەسەر هاتووە لە قورئانی پیرۆز ، و ڕوانیە ووتەی زانایان و شەرع زانان ، و کردنی بە یارمەتی دەری بۆ گەشتنی بە ئیجتیهادەکەی ، و کلیلێك بۆ ڕێگەکانی تێڕوانین و ڕاڤەیشە بۆ ئەو ڕستانەی کە زیاد لە واتایەك هەڵدەگرن

لە سوننەت ـ وە کەسیشیان لاسایەکی وایان نەکردووەتەوە ـ بەهەر حاڵێك بێت ـ هەروەکو چۆن لاسایی و ملکەچی پێویستە بۆ سوننەتەکان ، بێ تێڕامان لێیان ، خۆشی ڕزگار نەکردووە لە هەموو ئەو شتانەی کە زانایان خستوویانەتە ئەستۆی خۆیان لە لەبەرکردنی سوننەت و تێڕامان تیایاندا ، بەڵکو لاسایی کردوون لە لێکۆڵینەوە و تێگەیشتن و تێڕاماندا ، و سوپاسیشی کردوون لەسەر ئەو هەموو هەوڵ و کۆششەی کە داویانە بۆ سوود گەیاندن و ئاماژە پێدانانەی کە داویانە ، ستایشیشی کردوون لەسەر ئەو ووتانەیان کە تێیدا ڕستیان پێکاوە کە زۆرینەی ووتەکانیانە ، لەو لاشەوە بە دووری نەزانیوون لە هەڵە هەروەکو چۆن خۆیشیان خۆیانیان بە دوور نەزانیوە لە هەڵە ، ئا ئەمەیە ئەو کەسەی کە دەستی گرتووە بە ئەوەی کە سەلەفی صالحی لەسەر بووە ، هەر ئەویشە کە بەشی خۆی وەرگرتبێت ، و لە هیدایەتدا بێت و شوێنکەوتەی سوننەتی پەیامبەرەکەی بێت ﷺ ، و شوێنی بۆچوونی هاوەڵانی کەوتبێت ﷺ .

هەر کەسێکیش خۆی دوور بگرێت لە تێڕامان و بیرکردنەوە ، و ئەوانەشی پشت گوێ خست کەباسمان کردن ، و بە ڕاو و بۆچوونی خۆی پێچەوانەی سوننەتەکان بووەوە ، و هەوڵیدا بە پێی تێڕامانی خۆی لێکیان بداتەوە ئەوا ئەو کەسە گومڕا و گومڕاکارە ، و ئەو کەسەش کە هەموو ئەوانەی نەزانی ، و خۆشی هەڵقورتاندە ناو فەتوادانەوە بە بێ بوونی زانستی شەرعی ، و کوێرتر و گومڕاترە لە ئاست ڕێگە ڕاستەکە .

ئەمەیە ئەو ڕەواییەی کە هیچ شاراوە و نادیاریەکی تێدا نیە ، جا وازم لێ بێنە لە کەسانی دەست بەتاڵ .

٤ ـ پاشان لە لای هەندێك لە لاسای کاران گومانێك بەربڵاوە کە ڕێگرە لە شوێنکەوتنیان بۆ سوننەت کە ئەوەیان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە مەزهەب بە پێچەوانەی ئەوەیە ، ئەوەش ئەو گومانەیانە کە تێیدا دەڵێن : شوێنکەوتنی سوننەت ئەوە دەخوازێت کە خاوەنی مەزهەب بخەنە هەڵەوە ، خستنە هەڵەش لە لای ئەوان واتای توانج دانە لە

پێشەوای خاوەن مەزهەبەکە ، بۆیە لە کاتێکدا توانج دانە لە تاکی موسڵمانان نایێت ، چ جای توانج دان لە پێشەوایەك لە پێشەواکانیان ؟!

وەڵامی ئەوەش ئەوەیە کە بووترێت : ئەم واتایە هەڵەیە و هۆکار و فاکتەرێکە بۆ وازهێنان لە فێربوون و شارەزا بوون لە سوننەت ، ئەگەرنا چۆن کەسێك کە موسڵمان و ژیر بێت ئەو واتایە دەڵێت ؟!! لە کاتێکدا پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " إذا حكم الحاكم فاجتهد فأصاب فله أجران وإذا حكم فاجتهد فأخطأ فله أجر واحد " [٤١] ، واتە : ئەگەر دادوەر دوای کۆشش و ئیجتیهادێك حوکمێکی دا ، و پێکای ئەوا دوو پاداشتی هەیە ، بەڵام ئەگەر دوای کۆشش و ئیجتیهاد حوکمێکی دا ، و نەیپێکا ئەوا یەك پاداشتی هەیە .-

بۆیە ئەم فەرموودەیە ئەو واتایە ڕەت دەکاتەوە ، و بە شێوەیەکی ڕوون ئاشکرای دەکات کە هیچ شاراوەیەکی تێدا نیە کە ووتەی کەسێك بڵێت : ( فلانە کەس هەڵەی کرد ) ئەوە دەگەیەنێت لە شەرعدا کە : ( فلانە کەس یەك پاداشت دراوەتەوە ) ، جا ئەگەر ئەو پێشەوایە پاداشتێکی هەبێت لە بۆچوونی ئەو کەسەی کە بەهەڵەی دابنات ، چۆن کەسێك گومانی ئەوە دەبات کە بەهەڵە خستنەوەی توانجدانە لێی ؟!!!

گومان لەوەدا نیە کە ئەم گومانە شتێکی ناڕەوایە ، پێویستە لەسەر هەموو ئەوانەی کە پێی هەستاوون لێی پاشگەز و پەشیمان ببنەوە ، ئەگەر نا ئەوە کە توانج دەدات لە موسڵمانان ، نەك لە کەسێکی ئاساییان بەڵکو لە گەورە پێشەواکانیان لە هاوەڵان و شوێنکەوتووانیان ، و پێشەوایانی ئیجتیهادکاریان ، و جگە لەوانیش ، چونکە ئێمە دڵنیاین لەوەی کە ئەو شکۆدارانە ئەم ئەوی تریانی دەخستە هەڵەوە ، بەرپەرچی دەدایەوە ، جا کەسێکی ژیر هەیە بڵێت : هەندێکیان توانجی دەدا لە هەندێکە تریان ، بەڵکو جێگیر سەلمێنراوە لە پەیامبەری خواوە ﷺ کە ( أبو بكر ) ی بەهەڵە داناوە لەوەی کە خەوپەرژێنی خەوی کابرایەکی کرد کە خەوێکی بینی بوو ، و پێی فەرموو : " أصبت

---

[٤١] البخاري ومسلم .

بعضا وأخطأت بعضا " [٤٢] ، واتە : لە بڕێکیدا پێکات ، بەڵام لە بڕێکیدا نەتپێکاوە .

جا ئایا پەیامبەری خوا ﷺ بەم ووتەیەی توانجی لە ( أبو بكر ) داوە ؟!!

یەکێك لە ئەو کاریگەریە سەرسوڕهێنەرانەی کە ئەم گومانە لەسەر شوێن کەوتوانی هەیبووە ، ئەوەیە کە ڕێگربووە لەشوێنکەوتنیان بۆ سوننەتێك کە پێچەوانەی مەزهەبەکەیان بێت !! چونکە شوێنکەوتنیان بۆی ئەوە دەگەیەنێت کە توانج دەدەن لە پێشەواکەیان !! بەڵام شوێنکەوتنیان بۆ پێشەواکەیان ـ لەگەڵ پێچەوانە بوونەوەیان بۆ سوننەت ـ ئەوە دەگەیەنێت کە ڕێزیان لەپێشەواکەیان گرتووە ، و بەگەورەیان داناوە !!! بۆیە ئەوان سوورن لەسەر لاسایی کردنەوەی بۆ ڕاکردن لەو توانج لێدانەی کە جێی گومانیانە .

بێگومان ئەو کەسانە لە بیریان چووە ـ ناڵێم لە بیری خۆیانیان بردووەتەوە ـ کە ئەوان بەهۆی ئەم گومانەوە خۆیان خستوەتە خراپتر لەوەی کە ڕایان کردووە لێی ، چونکە ئەگەر کەسێك پێیان بڵێت : ئەگەر شوێنکەوتن نیشانەی ڕێز لێ گرتن بێت لەو کەسەی کە شوێنی دەکەوێت ، و پێچەوانە بوونەوەی بەڵگە بێت بۆ توانج لێدان لەو کەسەی کە پێچەوانەی دەبیتەوە ، باشە چۆن ڕێگەتان بە خۆتان داوە کە پێچەوانەی سوننەتی پەیامبەری خوا ﷺ ببنەوە ؟!! و واز بهێنن لە شوێن کەوتنی لە بەر شوێن کەوتنی پێشەوای مەزهەبەکەتان با پێچەوانەی سوننەتیش بێت ؟!! کە دوور نیە لە هەڵە ، و توانج دانیش لێی کوفر نیە !! جا ئەگەر لە لای ئێوە پێچەوانە بوونەوەی پێشەوای مەزهەبەکەتان بە توانج لێدان بزانن بۆ پێشەواکەتان ، ئەی خۆ پێچەوانە بوونەوەی پەیامبەری خوا ﷺ ئاشکرا ترە لەوەی کە توانج دانە لە پەیامبەری خوا ﷺ ، بەڵکو کوفرێکی ئاشکرایە ـ خوا پەنامان بدات لەو کوفرە ـ باوەڕم وایە یەکێك ئەمەیان پێ بڵێت هیچ وەڵامێکیان پێ نیە جگە لەو ووشەیە نەبێت ـ کە زۆر جار لە هەندێکیانەوە دەیبیسین ـ ئەویش ئەوەیە کە دەڵێن : ئێمە کە وازمان لە سوننەت هێناوە لە بەر متانە

---

[٤٢] البخاري ومسلم .

بوونمانە لەسەر پێشەوای مەزهەبەکەمان !! وە ئاشکراشە کە ئەو لە ئێمە شارەزا ترە بە سوننەتی پەیامبەر ﷺ .

وەڵامان بۆ ئەم ووتەیەشیان لە چەند ڕوویەکەوەیە : ئەگەر هەمووی بخرێتە ڕوو لەم پێشەکیە درێژە زۆر دەخایەنێت ، بەڵام هەوڵ دەدەم یەك ڕووی باس بکەم کە بە پشتیوانی خوای پەروەردگار وەڵامێکی یەك لایی کەرەوەیە بۆ ئەم باسە ، جا دەڵێم : تەنها پێشەوای مەزهەبەکەت نیە کە لە تۆ زاناتر بێت بە ڕێژەیەك ، بەڵکو دەیەها پێشەوای تر ـ بگرە سەدەها پێشەوای تر ـ هەن کە بە ڕێژەیەك لە تۆ زاناترن و شارەزا ترن ، جا ئەگەر سوننەتێکی ( صحيح ) ی پەیامبەری خوامان ﷺ پێ گەیشت و بە پێچەوانەی مەزهەبەکەتەوە بوو ، یەکێك لەو پێشەوایانەی وەریگرتبێت ، و کاری پێ بکات ـ وەرگرتنی ـ لە بار و حاڵی وادا ـ پێویست دەبێت لە لای ئێوە ، چونکە ئەو ووتەیەی کە دەیڵێن ناتوانن وازی لێ بێنن ، چونکە بەرهەڵستکارانتان بەرپەرچتان دەدەنەوە و دەڵێن : خۆ ئێمەش لە بەر متانە بوونمان لەسەر ئەو پێشەوایەی کە فەرموودەکەی وەرگرتووە ئەو فەرموودەیەمان وەرگرتووە ، ئاشکراشە کە شوێنکەوتنی پەیامبەر ﷺ لە پێشتر و ئەولاترە لە شوێنکەوتنی پێشەواکەتان کە پێچەوانەی ئەو سوننەتەیە ، ئەمەش شتێکی زۆر ئاشکرا و ڕوونە لە لای هەمووان ـ إن شاء الله ـ .

بۆیە لێرەدا من دەتوانم بڵێم : ئەم کتێبەی ئێمە لە کاتێکدا هەموو ئەو سوننەتانەی گرتووەتە خۆ و کۆکردۆتەوە کە لە پەیامبەری خواوە ﷺ جێگیر و سەلمێنراون سەبارەت بە چۆنیەتی نوێژەکەی ، هیچ بیانوویەك نیە بۆ کەس کە واز بهێنێت لە کارکردن پێی ، چونکە هیچ شتێکی تێدا نیە کە زانایان کۆڕا بن لەسەر وازلێهێنانی ـ حاشا و دوور لە زانایانی بەڕێز کە وابن ـ بەڵکو هیچ بابەتێکی تێدا نیە کە کۆمەڵێکیان ڕایان لەسەر بووە ، ئەوەشیان کە ئەوەی نەفەرموو بێت ئەوا عوزری بۆ ئەهێنینەوە ، و پاداشتێکیشی بۆ هەیە ، چونکە هیچ دەقێکی پێ نەگەشتووە لەو بارەیەوە ، یان ئەگەر پێی گەیشتووە بەڵام بە ڕێگەیەك کە نەگەشتوەتە ئەوەی کە ببێت

بە بەڵگە لەلایدا ، یان لە بەر هەر عوزرێکی تر لەو عوزرانەی کە لە لای زانیان زانراوە ، بەڵام ئەو کەسەی کە فەرموودەکەی لە لا جێگیر بێت و بسەلمێت ئەوا هیچ بەهانە و بیانوویەك ناخوات لەوەی کە لاسایی پێشەواکەی بکاتەوە ، بەڵکو پێویستە لەسەری شوێنی فەرموودەکە بکەویت کە دوورە لە هەموو هەڵەیەك ، هەر ئەمەشە مەبەست لەم پێشەکیە ، خوای پەروەردگار دەفەرموویت : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾ [٤٣] .

خوای پەروەردگاریش بێژەری ڕاستی و ڕەواییە ، و هەر ئەویشە ڕێنموکار و ڕێنیشاندەر بۆ ڕێگای ڕاست ، باشترین پشتیوان ، و چاکترین سەرخەریش هەر خۆیەتی .

وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه وسلم

والحمد لله رب العالمين

دمشق ٢٠ / ٥ / ١٣٨١ هـ

محمد ناصرالدين الألباني

---

[٤٣] الأنفال : ٢٤ .

بسم الله الرحمن الرحيم

## ڕووكردن له كه‌عبه

**په‌یامبه‌ری خوا ﷺ ئه‌گه‌ر هه‌ستایه بۆ نوێژ ڕووی له كه‌عبه ده‌كرد ، له فه‌رز و سوننه‌ته‌كان دا [١] ، وه فه‌رمانیشی به‌و كاره كردووه ، به‌و پیاوه‌ی كه نوێژه‌كه‌ی به‌ته‌واوی ئه‌نجام نه‌دا ( المسيء صلاته ) ، و پێی فه‌رموو : " إذا قمت إلى الصلاة فأسبغ الوضوء ، ثم استقبل القبلة فكبر " [٢] ، واته : ئه‌گه‌ر هه‌ستای بۆ ئه‌نجامدانی نوێژ ، ئه‌وا به‌باشی ده‌ستنوێژ بشوه و پاشان ڕوو له قیبله بكه و بڵێ : ( الله أكبر ) .**

**وه " په‌یامبه‌ری خوا ﷺ نوێژه سوننه‌ته‌كانی له‌سه‌ر ولاْخه‌كه‌ی ئه‌نجام ده‌دا ، هه‌روه‌ها نوێژی وه‌تریشی به هه‌مان شێوه ئه‌نجام ده‌دا ، ڕووی له هه‌ركوێ بوایه [ ڕووه و ڕۆژهه‌لاْت بێ یان ڕووه و ڕۆژئاوا ] " [٣] .**

**ئه‌م ئایه‌ته‌ش كه خوای په‌روه‌ردگار تێیدا فه‌رموویه‌تی: ﴿ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ ﴾ [٤] ، هه‌ر له‌م باره‌یه‌وه هاتۆته خواره‌وه [٥] .**

**وه " هه‌ندێك جاریش ئه‌گه‌ر بیویستایه نوێژه سوننه‌ته‌كانی له‌سه‌ر وشتره‌كه‌ی ئه‌نجام بدا ، ڕووی ده‌كرد له قیبله و ته‌كبیره‌ی ئیحرامی داده‌به‌ست و پاشان ولاْخه‌كه‌ی ڕووی له هه‌ر كوێ بكردایه نوێژه‌كه‌ی به‌سه‌ریه‌وه ده‌كرد ، و نوێژه‌كه‌ی نه‌ده‌بڕی " [٦] .**

---

[١] **ئه‌مه شتێكی به‌ڵگه نه‌ویسته ؛** چونكه به ( تواتر ) ی پێمان گه‌شتوه له په‌یامبه‌ری خواوه ﷺ ، بۆیه پێویست به به‌ڵگه هێنانه‌وه ناكات ، به‌لاّم سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش هه‌ندێك شتت به‌رچاو ده‌كه‌وێت ده‌بنه به‌ڵگه‌ی ئه‌م كرداره .

[٢] البخاري ومسلم و السراج ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٢٨٩ ) .

[٣] البخاري ومسلم و السراج .

[٤] البقرة : ١١٥ .

[٥] رواه مسلم وصححه الترمذي .

وە " کرنوش وسوژدەکانی بەسەر وڵاخەکەیەوە دەبرد ، ئەوەش بە ئاماژە کردنی بە سەری ، بە شێوەیەك سوژدەکەی نزمتر دەکرد لە کڕنوشەکەی " [٧] .

وە " ئەگەر بیویستایە نوێژە فەرزەکانی ئەنجام بدات لەسەر وڵاخەکەی دەهاتە خوارەوە و ڕووی لە قیبلە دەکرد " [٨] .

بەڵام لەو نوێژانەی کە لە کاتی ترسی زۆردا ئەنجام دەدرێت ، پەیامبەری خوا ﷺ کردوویەتی بە سوننەت بۆ ئوممەتەکەی بە " هەستانەوە بێت بە پێوە بن یان بە سواری ، ڕوو لە قیبلە بن یان ڕوو لە قیبلە نەبن " نوێژەکەیان ئەنجام بدەن [٩] ، و فەرموویەتی : " إذا اختلطوا : فإنما هو التكبير و الإشارة بالرأس " [١٠] ، واتە : ئەگەر تێڕشان بوو لە کاتی جەنگدا ئەوا ئەنجامدانی نوێژ تەنها بریتیە لە دابەستنی تەکبیرەی ئیحرام وئاماژەکردن بە سەر .

وە پەیامبەری خوا ﷺ دەیفەرموو :" ما بين المشرق و المغرب قبلة " [١١] ، واتە : نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەموو قیبلەیە .

وە ( جابر ) ﷺ فەرموویەتی : " لە سەفەرێکدا ، یان لە سریەیەکدا لە گەڵ پەیامبەری خوادا بووین ﷺ لەوکاتەدا هەور ڕووی ئاسمانی گرتبوو ، بەدوای قیبلەدا گەڕاین ، بەڵام بۆچون و دیدی جیاوازمان هەبوو لە دیاریکردنیدا ، لە بەر ئەوە هەرکەسێك و بەتەنها نوێژەکەمان ئەنجامدا ، پاشان هەر کەسێکمان هێڵێکی لە بەر

---

[٦] رواه أبو داود وابن حبان في ( الثقات : ١ / ١٢ ) ، والضياء في ( المختارة ) بسند حسن ، وصححه ابن الملقن في ( خلاصة البدر المنير : ٢٢ / ١ ) ، ومن قبلهم عبد الحق الإشبيلي في ( أحكامه : رقم ١٣٩٤ بتحقيقي ) ، وبه قال أحمد فيما رواه ابن هانئ عنه في ( مسائله : ١ / ٦٧ ) .

[٧] أحمد والترمذي وصححه .

[٨] البخاري وأحمد .

[٩] البخاري ومسلم ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٥٨٨ ) .

[١٠] البيهقي بسند " الصحيحين " .

[١١] الترمذي والحاكم وصححاه ، وقد خرجته في ( إرواء الغليل تخريج أحاديث منار السبيل : ٢٩٢ ) ، وقد يسر الله طبعه .

دەستی خۆیدا ڕاکێشا بۆ ئەوەی هەریەکێك ئاراستەی نوێژی خۆی بزانێت ، کاتێك کە ڕۆژ بووەوە سەیری هێڵەکانمان کرد بینیمان هیچ کەسێکمان ڕووی لە قیبلە نەبووە ، پاشان ئەو کردارەمان بۆ پەیامبەری خوا ﷺ گێڕایەوە ، کەچی فەرمانی پێ نەکردین نوێژەکەمان دووبارە بکەینەوە ، وە پێی فەرمووین : " قد أجزأت صلاتكم " [١٢] ، واتە : نوێژی هەمووتان دروستە و دووبارە کردنەوەتان لەسەر نیە .

وە " پەیامبەری خوا ﷺ پێش گۆڕینی قیبلە نوێژەکانی ڕوو لە ( بیت المقدس ) ئەنجام دەدا و کەعبەش لە پێش ڕووگەیدا ( قیبلة ) بوو ، پێش ئەوەی ئەم ئایەتە : ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ﴾ [١٣] ، بێتە خوارەوە ، بەڵام کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ڕووی لە کەعبە کرد ، لە کاتێکدا موسڵمانان لە مزگەوتی ( قُباء ) ـدا لە نوێژی بەیانیدا بوون ، لەو کاتەدا کەسێك هات بۆ لایان و پێی ڕاگەیاندن کە پەیامبەری خوا ﷺ ئەم شەو قورئانی بە سەردا دابەزیوە و فەرمانی پێ کراوە ڕوو لە کەعبە بکات ، جا ڕوو لە کەعبە بکەن ، لەو کاتەدا ڕوویان لە شام بوو ، وەرچەرخان ، [ و پێشنوێژەکەشیان ڕووی وەرچەرخاندەوە تاکو ڕووی پێ کردن لە کەعبە ] " [١٤] .

---

[١٢] الدارقطني ، والحاكم ، والبيهقي ، وله شاهد عند الترمذي ، وابن ماجه ، وآخر عند الطبراني ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٢٩٦ ) .

[١٣] البقرة : ١٤٤ .

[١٤] البخاري ومسلم وأحمد والسراج والطبراني ( ٣ / ١٠٨ / ٢ ) ، وابن سعد ( ١ / ٢٤٣ ) ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٢٩٠ ) .

## ڕاوەستان

پەیامبەری خوا ﷺ لە نوێــژدا لــە فــەرزەکانیدا بێـت یـان لـە سوننەتەکـان ڕادەوەستا ، وەکـو جێ بـەجێکردنێك بـۆ فەرمـانی خوای پەروەردگار کە فەرمووویـەتی : ﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ﴾ [١٥] .

بەڵام لە سەفەردا ، نوێژە سوننەتەکانی بە سەر وڵاخەکەیەوە ئەنجام دەدا .

وە کردوویەتی بە سوننەتیش بۆ ئوممەتەکـەی لـە کـاتی ترسـدا بەڕێکردنـەوە یـان بەسواری نوێژەکانیان ئەنجام بدەن هـەروەکو لـە پێـشدا باسـی لێـوەکرا ، بەڵگـەی ئـەم وتەیەش ئەو ئایەتەیە کە خـوای پـەروەردگار فەرمووویـەتی : ﴿حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى [١٦] وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَا أَمِنْتُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُمْ مَا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ﴾ [١٧] ، واتە: پارێزگاری لە نوێژەکانتان بکەن ، بەتایبەت نوێژی ناوەڕاست کە نوێژی عەسرە ، وە ڕاوەستن لە نوێژەکانتان بۆ خوای گەورە ، بەڵام ئەگەر ترسـان ئـەوا بەڕێکردن یان بەسواریەوە ، وە لە کاتێکدا ترس نەماو بارودۆخ ئاسایی بووەوە ئەوا یادی خوا بکەن لەو شتانەی کە فێری کردن و لە پێشدا لێی بێ ئاگابوون .

وە " پەیامبەری خوا ﷺ لە و نەخۆشیەی کە تێیدا کۆچی دوای کرد بە دانیشتنەوە نوێژەکانی ئەنجام دەدا " [١٨] .

هەروەها جارێکی تریش بەم شێوەیە ئەنجامی داوە ، ئەوەش لە کاتێکدا بـوو کـە " ئازاری هەبوو ، و خەڵکەکەش بەدوایدا بە پێوە نوێژیان دەکرد : ئەویش ئاماژەی بۆ کردن

---

[١٥] البقرة : ٢٣٨ .

[١٦] **ووتەی هەڵبژاردە ئەوەیە کە :** ( الصلاة الوسطى ) نوێژی عەسرە لەلای زۆرینەی زانایان ، لەوانەش : ( أبو حنيفة ) و هاوەڵەکەی ، فەرموودەیەکی زۆریش لەو بارەیەوە هاتووە کە ( الحافظ ابن كثير ) زۆربەی هێناوەتەوە .

[١٧] البقرة : ٢٣٨ و ٢٣٩ .

[١٨] الترمذي وصححه ، وأحمد .

كە دانیشن ، ئەوانیش دانیشتن ، لە کاتێکدا کە نوێژەکەی تەواوکرد فەرمووی : " إن كدتم آنفاً لتفعلون فعل فارس و الروم : يقومون على ملوكهم وهم قعود فلا تفعلوا ، إنما جُعِلَ الإمامُ ليؤتم به : فإذا ركع فاركعوا ، و إذا رفع فارفعوا ، وإذا صلى جالساً فصلوا جلوساً [ أجمعون ] " [١٩] ، واتە : ئەوەندەی نەمابوو ـ پێش تۆزێك ـ کرداری فارس و ڕۆمەکان ئەنجام بدەن ، لەوەی کە بە سەر سەرکردەکانیانەوە ڕادەوەستان و ئەوانیش دادەنیشتن ، ئەو کارە ئەنجام نەدەن ، پێشنوێژ بۆ ئەوە دانراوە لاسایی و ئیقتدای پێوە بکرێتەوە ، ئەگەر کڕنووشی برد ئێوەش کڕنووش بەرن ، وە ئەگەر هەستایەوە پاش ئەو هەستنەوە ، وە ئەگەر نوێژەکەی بەدانیشتنەوە کرد ئێوەش هەمووتان بە هەمان شێوە بەدانیشتنەوە ئەنجامی بدەن .

---

[١٩] البخاري ومسلم ، وهو مخرج في كتابي ( إرواء الغليل : تحت الحديث : ٣٩٤ ) .

## نوێژی نەخۆش بەدانیشتنەوە

( عمران ) ـی کوڕی ( حصین ) رضي الله عنه فەرموویەتی : " نەخۆشی مایە سیریم ( البواسیر ) هەبوو ، پرسیارم لە پەیامبەری خوا کرد ﷺ سەبارەت بە چۆنێتی نوێژکردنم ؟ فەرمووی : " صلِّ قائماً ، فإن لم تستطع فقاعداً ، فإن لن تستطع فعلى جَنبٍ "[٢٠] ، واتە : بە پێوە نوێژەکانت ئەنجام بدە ، ئەگەر نەتوانی ئەوا بە دانیشتنەوە ئەنجامیان بدە ، دیسان ئەگەر نەتوانی ئەوا بەڕاکشانەوە لەسەر لا ئەنجامیان بدە .

هەروەها فەرموویەتی : " پرسیارم لە پەیامبەری خوا ﷺ کرد سەبارەت بە نوێژی کەسێك نوێژەکەی بە دانیشتنەوە ئەنجام بدات ؟ لە وەڵام دا فەرمووی : " من صلى قائماً فهو أفضل ، ومن صلى قاعداً فله نصف أجر القائم ، ومن صلى نائماً [ وفي رواية : مضطجعاً ] فله نصف أجر القاعد "[٢١] ، واتە : ئەو کەسەی بە ڕاوەستانەوە نوێژەکەی ئەنجام بدات ئەوە چاکترە ، وە ئەو کەسەش نوێژەکەی بە دانیشتنەوە ئەنجام بدات ئەوە نیوەی پاداشتی ڕاوەستاوی هەیە ، وە ئەو کەسەش بە ڕاکشانەوە ئەوە نیوەی پاداشتی دانیشتوەکەی هەیە . مەبەستیش پێی ـ واتە : کەسی ڕاکشاوە ـ نەخۆشەکەیە .

( أنس ) رضي الله عنه فەرموویەتی : کۆمەڵێك لە موسڵمانان بە هۆی نەخۆشی یەوە بە دانیشتنەوە خەریکی ئەنجامدانی نوێژەکانیان بوون کە پەیامبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە چاوی پێیان کەوت فەرمووی : " إنَّ صلاة القاعد على النصف من صلاة القائم "[٢٢] ،

---

[٢٠] البخاري وأبو داود وأحمد ، پێشەوا ( الخطابي ) فەرموویەتی : " مەبەست لە فەرموودەکەی ( عمران ) ئەوکەسەیە کە لە نوێژی فەرزدا دەتوانێت بووەستێ ، بەڵام نارەحەت دەبێت بەو وەستانە ، بۆیە پاداشتی دانیشتوو کراوە بە نیوەی پاداشتی وەستاو تیایدا ، بۆ ئەوەی ببێتە هاندەرێك بۆی هەوڵی هەستان بدات و نارامیش بگرێت لە سەر نارەحەتیەکانی لە گەڵ ڕەوایی دانیشتنی " ، پێشەوا ( الحافظ ) لە ( الفتح : ٢ / ٤٦٨ ) دا فەرموویەتی : " ئەوەش لێکدانەوەیەکی باشە " .

[٢١] البخاري وأبو داود وأحمد .

[٢٢] أحمد وابن ماجه بسند صحيح .

واته : نوێژی کەسێك کە بە دانیشتنەوە نوێژەکەی ئەنجام بدات پاداشتەکەی نیوەی نوێژی کەسێکە کە نوێژەکەی بە هەستانەوە ئەنجام بدات .

وە جارێکیان کە پەیامبەری خوا ﷺ سەردانی نەخۆشێك دەکات دەبینێ لەسەر داپۆشەرێك ـ یفەبێ یان بەتانی یان هەرشتێك کە مرۆڤ خۆی پێدادەپۆشێ ـ نوێژەکەی دەکات ، ئەویش لای دەبا و فڕێی دەدات ، ئەم جارەیان دارێك دێنێ بۆ ئەوەی نوێژەکەی لەسەر بکات ، جارێکی تر پەیامبەری خوا ﷺ لای دەبا و فڕێی دەدات ، پاشان دەفەرمووێ : " صلِّ على الأرض إن استطعت ، وإلا فأوْمِ إيماءً ، واجعل سجودك أخفض من ركوعك " [٢٣] ، واتە : ئەگەر توانیت لەسەر زەوی نوێژەکەت ئەنجام بدە ، ئەگەر نەتوانی تەنها بە ئاماژە کردن نوێژەکانت ئەنجام بدە ، و با سوژدەکانت لە کڕنوشەکانت نزمتر بن .

## نوێژکردن لە کەشتیدا

پەیامبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرا سەبارەت بە نوێژکردن لە کەشتیدا ؟ فەرمووی : " صلِّ فيها قائماً ، إلا أن تخاف الغرق " [٢٤] ، واتە : بە پێوە نوێژی تێدا بکە ، ئیللا ئەگەر ترسی ئەوەت بوو بخنکێیت .

وە کاتێك پەیامبەری خوا ﷺ بەساڵداچوو و تەمەنی گەورەبوو ، لە شوێنی نوێژەکەی کۆڵەکەیەکی بۆ خۆی دانابوو و دەستی پێوە دەگرت [٢٥] .

---

[٢٣] الطبراني والبزار وابن السماك في ( حديثه : ٨٢ / ٢ ) والبيهقي ، وسنده صحيح كما بينته في ( الصحيحة : ٣٢٣ ) .

[٢٤] البزار (٦٨) والدارقطني وعبدالغني المقدسي في ( السنن : ٨٢ / ٢ ) ، وصححه الحاكم ، و وافقه الذهبي .

**سوودێك** : حوکمی نوێژکردن لە فڕۆکەدا هەمان حوکمی نوێژی هەیە لە کەشتیدا : کە بە پێوە نوێژ بکات ئەگەر لە توانایدا بوو ، ئەگینا بە دانیشتنەوە نوێژەکەی دەکات و لە کڕنووش و سوژدەکانیدا تەنها بەسەر ئاماژە دەکات هەر وەکو لە پێشدا باسکرا .

[٢٥] أبو داود والحاكم وصححه هو والذهبي ، وقد خرجته في ( الصحيحة : ٣١٩ ) ، و ( الإرواء : ٣٨٣ ) .

## ڕاوەستان و دانیشتن لە شەونوێژدا

وە " پەیامبەری خوا ﷺ شەوانێکی درێژ نوێژی بە پێوە دەکرد ، وە شەوانێکی درێژی تری بە دانیشتنەوە نوێژەکانی ئەنجام دەدا ، ئەگەر بەپێوە قورئانی ناو نوێژەکەی بخوێندایە ئەوا بەپێوە کڕنووشەکانی دەبرد ، وە ئەگەر بەدانیشتنەوە قورئانەکەی بخوێندایە هەر بەدانیشتنەوە کڕنووشەکانی دەبرد " (٢٦) .

وە " جاری واش هەبوو بە دانیشتنەوە نوێژەکەی ئەنجام دەدا ، بە هەمان شێوە خوێندنەوەکەشی ، تاکو ئەو کاتەی کە نزیکەی سی یان چل ئایەت لە خوێندنەوەکەی دەمایەوە ، ئەو کاتە هەڵدەسا ، و بەپێوە ئەو ئایەتانەی تەواو دەکرد ، و پاشان کڕنووش و سوژدەکانی دەبرد ، پاشان ئەوەی کە لە ڕکاتی یەکەمدا ئەنجامی دابوو لە ڕکاتی دووەمیشدا دووبارە ئەنجامی دەدایەوە " (٢٧) .

وە " لە دوا دوایی تەمەنیدا نوێژە سوننەتەکانی بە دانیشتنەوە ئەنجام دەدا ، ئەوەش پێش مردن و کۆچکردنی بوو بە ساڵێك " (٢٨) .

وە " شێوەی دانیشتنەکەشی چوارمشقی ( یان : چوارچمکی ) بوو " (٢٩) .

---

(٢٦) مسلم وأبو داود .

(٢٧) البخاري ومسلم .

(٢٨) مسلم وأحمد .

(٢٩) النسائي وابن خزيمة في ( صحيحه : ١ / ١٠٧ / ٢ ) و عبدالغني المقدسي في ( السنن : ٨٠ / ١ ) والحاكم وصححه ، ووافقه الذهبي .

## نوێژکردن به پێڵاوەوە ، و فەرمان پێکردنی

وە " هەندێك جار بە پێی پەتی ( بە پێ خواسی ) ڕادەوەستا و هەندێك جاریش بە پێڵاوەوە " [٣٠] .

وە ڕێگەشی بەو کارە داوە بۆ ئوممەتەکەی و فەرمووییەتی : " إذا صلى أحدكم فليلبس نعليه أو ليخلعهما بين رجليه ، ولا يؤذي غيره " [٣١] ، واتە : ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە ویستی نوێژەکەی ئەنجام بدات ، ئەوا با پێڵاوەکانی لە پێ بکات ، یان دایان کەنێت و لە نێوان پێکانیدا دایان بنێت و کەسیان پێ ئازار نەدات .

بەڵکو ـ هەندێك جاریش ـ جەختی لەسەر کردوون کە نوێژەکانیان بە پێڵاوەوە ئەنجام بدەن ، هەروەکو فەرموویەتی : " خالفوا اليهود فإنهم لا يصلون في نعالهم ولا خفافهم " [٣٢] ، واتە: پێچەوانەی جولەکەکان بن ، چونکە ئەوان بە پێڵاوەوە یان بە خوففەکانیانەوە نوێژ ئەنجام نادەن .

وە لەوانەیە هەندێك جار لە کاتی نوێژکردنیدا پێڵاوەکانی لە پێ دابکەندایە ، پاشان بەردەوام دەبوو لە نوێژەکەی ، هەر وەکو ( أبو سعيد ) ـی ( الخدري ) ﷺ بۆمانی دەگێڕێتەوە و دەفەرموویت : " ڕۆژێکیان پەیامبەری خوا ﷺ پێشنوێژی بۆ دەکردین ، لە ناو نوێژەکەیدا بوو ، پێڵاوەکانی داکەند و لە لای چەپی خۆیەوە داینان ، لە کاتێکدا کە خەڵکەکە ئەوەیان بینی ئەوانیش بەهەمان شێوە پێڵاوەکانیان داکەند ، و پاشان کە پەیامبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەی بووەوە ، فەرمووی : " ما بالكم ألقيتم نعالكم ؟ " ، واتە : ئەوە چی بوو پێڵاوەکانتان داکەند؟ ئەوانیش فەرمویان : کە تۆمان بینی پێڵاوەکانت داکەند ئێمەش پێڵاوەکانمان داکەند ، ئەویش فەرمووی : " إن جبريل أتاني فأخبرني أن فيهما قذراً ـ أو قال : أذى ـ ( وفي رواية : خبثاً ) فألقيتهما ، فإذا جاء

---

[٣٠] أبو داود وابن ماجه ، وهو حديث متواتر كما ذكر الطحاوي .

[٣١] أبو داود والبزار ( ٥٣ ـ زوائده ) ، وصححه الحاكم ، ووافقه الذهبي .

[٣٢] أبو داود والبزار ( ٥٣ ـ زوائده ) ، وصححه الحاكم ، ووافقه الذهبي .

أحدكم إلـى المسجد ، فلينظر في نعليه ، فإن رأى قـذرا ـ أو قـال : أذى ـ ( وفي الرواية الأخرى : خبثا ) ، فليمسحهما وليصل فيهما ) " [٣٣] .

وا تە : لە کاتی نوێژدا جبریل عليه السلام هات بۆ لام و پێـی ڕاگەیانـدم کـە پێڵاوەکـانم پیسیان پێوەیە بۆیە منیش دامکەندن و لامبردن ، جا ئەگەر هەریەك لە ئێوە هـات بـۆ مزگەوت ، با بروانێتە ژێر پێڵاوەکانی ، ئەگەر پیسیەکیان پێوە بـوو ، بـا بیـانهێنی بـە زەویدا ، و پاشان نوێژەکەی پێوە بکات .

وە " پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر پێڵاوەکانی دابکەندایە ئەوا لە لای چەپی خۆیەوە دای دەنان [٣٤] ، وە دەیفەرموو : " إذا صلى أحدكم ، فلا يضع نعليه عن يمينه ، ولا عن يساره فتكون عن يمين غيره ، إلا أن لا يكون عن يساره أحـد ، وليضعهما بين رجليه " [٣٥] ، واتە : ئەگەر هەریەکێك لـە ئێـوە ویـستی نوێژەکـەی ئـەنجام بـدات ، ئـەوا بـا پێڵاوەکانی لە لای ڕاستیەوە دانەنات ، وە نەیخاتە لای چەپیەوە لەو کاتەدا دەکەوێتە لای ڕاستی یەکێکی ترەوە ، جگە لە و کاتەی کە کەس لە لای چـەپیەوە نـەبێت ، وە بـا لـە نێوان پێکانیەوە دایان بنێت .

---

[٣٣] أبو داود وابن خزيمة والحاكم وصححه ووافقه الذهبي والنووي ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٢٨٤ ) .

[٣٤] أبو داود وابن خزيمة والحاكم وصححه ووافقه الذهبي والنووي .

[٣٥] أبو داود والنسائي وابن خزيمة ( ١ / ١١٠ / ٢ ) بسند صحيح .

## نوێژکردن به سەر مینبەرەوە

" جارێکیان پەیامبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەرەکەیەوە نوێژی ئەنجام دا ، ( لە ریوایەتێکدا هاتووە : کە مینبەرەکەی سێ پلەی هەبووە ) [٣٦] ، [ لەسەر مینبەرەکەی ڕاوەستا و تەکبیرەی ئیحرامی دابەست ، و خەڵکەکەش بە دوایدا تەکبیرەی ئیحرامیان دابەست ] ، [ پاشان هەر لەسەر مینبەرەکەوە کڕنووشی برد ] ، و پاشان کە ڕاست بووەوە لە کڕنووشەکەی ، دوابەدوا لە مینبەرەکە دێتە خوارەوە تاکو لە بنەواو پایینەی مینبەرەکەی لەسەر زەوی سوژدەکەی دەبات ، پاشان دەگەڕێتەوە سەرەوە ، و [ ئەوەی لە ڕکاتی یەکەمدا کردوویەتی لە ڕکاتی دووەمیشدا ئەنجامی دەدات ] ، تاکو بەو شێوەیە کۆتای بە نوێژەکەی دێنێ ، و ڕوو دەکاتە خەڵکەکەو دەفەرمووێت : " يا أيها الناس إني صنعلت هذا لتأتموا بي ، ولتعلموا صلاتي " [٣٧] ، واتە : ئەی خەڵکینە ! ئەو کارەم ئەنجام دا بۆ ئەوەی چاوم لێ ببڕن لاسایم بکەنەوە و فێری چۆنێتی نوێژەکەم بن .

---

[٣٦] ئەمەیە سوننەت لە مینبەردا : کە ئەبێ سێ پلەی هەبێت ، نەك زیاتر ، زیادکردنیش لە سەری بیدعەیە لە سەردەمی ئومەویەکاندا داهێنراوە ، زۆرجاریش دەبێتە هۆی بڕینی ڕیزەکانی نوێژ ، بۆ خۆ ڕزگار کردنیش لەو شتە ئەوەیە کە لە لای خۆرئاوای مزگەوتەوە دابنرێت ، میحرابیش بیدعەیەکی ترە ، هەروەها بەرزکردنەوەشی وەکو بەلەکۆنەیەك ( الشرفة ) وتار خوێنەکەش بە هۆی پەیژەیەکی لکاو بەدیوارەکە دەچێتە سەری ! وە باشترین ڕێچکەو ڕێبازیش ڕێبازی پەیامبەرە ﷺ . ( بڕوانە : الفتح : ٢ / ٣٣١ ) .

[٣٧] البخاري ومسلم والرواية الأخرى له وابن سعد ( ١ / ٢٥٣ ) ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٥٤٥ ) .

## بەربەست ، و واجب بوونی

" پەیامبەری خوا ﷺ نزیك لە بەربەستەكەی ڕادەوەستا ، و دووری نێـوان خـۆی و ئەو دیوارەی كە دەیكردە بەربەست سێ باڵ دەبوو " [٣٨] ، وە " لە نێـوان سـوژدەكەی و ئەو دیوارەی كە دەیكردە بەربەست ڕێڕەوی شەكێك بوو " [٣٩] .

وە دەیشی فـەرموو : " لا تصل إلا إلـى سترة ، ولا تدع أحداً يـمر بين يديك ، فإن أبـى فالتقاتله ؛ فإنّ معه القرين " [٤٠] ، واتە : ڕووە و بەربەست نەبێ نوێژ مەكە ، و ڕێگەیش بە كەس مەدە بە بەردەستتدا تێپەڕێت ، ئەگەر هەر سوربوو لەسـەر ڕۆیـشتن ئەوا لە گەڵیدا بجەنگێ ، چونكە شەیتانی لەگەڵدایە .

هەروەها دەیفـەرموو : " إذا صلى أحدكم إلـى سترة ؛ فليدن منها ، لا يقطعـن الشيطان عليه صلاته " [٤١] ، واتە : ئەگەر یەكێك لە ئێوە ڕووەو بەربەستێك نوێژی كرد ، با لێی نزیك بێتەوە ، نەكو شەیتان نوێژەكەی پێ ببڕێت .

وە " هەندێك جار لە كاتی نوێژكردنیدا هەوڵی دەدا كۆڵەكەی مزگەوتەكـە بكاتـە بەربەست " [٤٢] .

---

[٣٨] البخاري وأحمد .

[٣٩] البخاري ومسلم .

[٤٠] ابن خزيمة في ( صحيحه : ١ / ٩٣ / ١ ) بسند جيد .

[٤١] أبو داود والبزار ( ص ٥٤ ـ زوائده ) والحاكم وصححه ووافقه الذهبي والنووي .

[٤٢] دەڵێم : دانانی سوترە پێویستە لە سەر پێشنوێژ بێت ، یان نوێژكـەر بەتـەنها ، بـا لـە مزگـەوتێكی گەورەشدا بێت . ( ابن هانِئ ) لە " مسائل " ـەكانیدا لە " إمام أحمد " وە ، لە ( ١ / ٦٦ ) فەرموویەتی : " رآنـي أبو عبدالله ( يعني : الإمام أحمد ) يوما وأنا أصلي وليس بين يدي سترة ـ وكنت معه في المـسجد الجامع ـ فقال لـي : استتر بشيء . فاستترتُ برجل " .

دەڵێم : لەم ڕووداوەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە پێشەوا ( أحمد ) مەبەستی ئەوەیە كە جیاوازی نیە لە نێوان مزگەوتی بچوك و مزگەوتی گەورەدا ، لە دانانی سوترەدا ، ئەوەش ووتەیەكی ڕەوایە .

وه " ئەگەر هاتوو نوێژی لە دەشتێکدا ئەنجام بدایە و هیچ شتێك نەبوایە بیکات بە بەربەست ، خەنجەرێکی لە بەردەستدا بەزەویدا دەچەقاند پاشان نوێژی ڕووەو ئەو خەنجەرە دەکرد و خەلکەکەش بە دوایدا بوون " [٤٣] وه هەندێك جار " ولاّخەکەی لابەلا دادەنا و لە نوێژەکەیدا ڕووی لێ دەکرد " [٤٤] ، ئەمە نوێژ لە پەچەی ووشتر ( أعطان الإبل ) ناگرێتەوە ، چونکە پێچەوانەیەتی ، و" پەیامبەری خوا ﷺ نەهی لێ کردووە " [٤٥] ، وە هەندێك جاریش " زینی ولاّخەکەی ڕێك دەخست و لە نوێژەکەیدا ڕووی لێ دەکرد " [٤٦] .

وه دەیفەرموو : " إذا وضع أحكم بين يديه مثل موخرة الرحل [٤٧] فليصل ولا يبالي من مرَّ وراء ذلك " [٤٨] ، واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە وەکو ئەو دارەی لەبەردەستدا بێ کە لەدواوەوەی زینی ولاّخدا هەیە ، ئەوا با نوێژەکەی بکات و هیچ باکێکی نەبێ بەو کەسانەی کە بەودیوی بەربەستەکەدا دەڕۆن .

---

ئەمەش یەکێکە لەو کردارانەی کە زۆربەی نوێژگەران تێیدا کەمتەرخەمن پێشنوێژ بێ یان مەئموم ، لە هەموو ئەو ولاّتانای کە تیایاندا گەڕاوم ، یەکێك لەو ولاّتانە سعودیەیە کە بۆ یەکەم جار ڕێم پێدرا تیایدا بسوڕێمەوە لە مانگی ڕەجەب سالّی ( ١٤١٠ هـ ) ـدا بوو ، بۆیە پێویستە لە سەر زانایان مسلّمانان ئاگادار بکەنەوە ، و هانی خەلکی بدەن بۆی ، و ئەحکامەکانی بۆ موسلّمانان ڕوون بکەنەوە ، ئەبێ ئەوەش بزانرێت کە ئەو ئەحکامانە کەعبە و مزگەوتی پەیامبەری خواش ﷺ دەگرێتەوە .

[٤٣] البخاري ومسلم وابن ماجه .

[٤٤] البخاري وأحمد .

[٤٥] البخاري وأحمد .

[٤٦] ومسلم ابن خزيمة ( ٩٢ / ٢ ) و أحمد .

[٤٧] **بضم الميم وكسر الخاء وهمزة ساكنة** : بە چەند شێوەیەکی تریش دەخوێنرێتەوە : واتاکەشی : ئەو دارەیە کە لە پشکەی زینی ولاّخدا هەیە .

[٤٨] مسلم وأبو داود .

وە " جارێکیان پەیامبەری خوا ﷺ ڕووە و دارێك نوێژی دەکرد " [49] ، وە " جاری واش هەبوو ڕووە و جێگەی خەوتنەکەی نوێژی دەکرد ، و ( عائشة ) یش بەسەریەوە ڕاکشابوو [ لە ژێر لێفەکەی دا ] " [50] .

پەیامبەری خوا ﷺ ڕێی بە هیچ نەدەدا بەبەینی ئەو و بەربەستەکەیدا تێپەر ببێت ، جارێکیان " پەیامبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد ، شەکێك ویستی بە بەردەستیدا تێپەر ببێ ، بەڵام پەیامبەری خوا ﷺ دەست پێش خەربوو ( سابقها ) ، بە شێوەیەك سکی بە دیوارەکەوە لکاند ، و [ وای لێ کرد بەپشتیدا تێپەر ببێ ] [51] .

وە " جارێکیان لە نوێژێك لە نوێژە فەرزەکانیدا بوو دەستی کێشایەوە ، پاشان کە لە نوێژەکەی بووەوە ، ووتیان : ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ! هیچ لە نوێژ گۆڕا ؟

فەرمووی : " لا ، إلا أن الشيطان أراد أن يمرَّ بين يدي فخنقته حتى وجدت برد لسانه على يدي ، وأيم الله لولا ما سبقني إليه أخي سليمان ؛ لارتبط إلى سارية من سواري المسجد حتى يطيف به ولدان أهل المدينة [ فمن استطاع أن لا يحول بينه وبين القبلة أحد فليفعل ] " [52] ، واتە : نەخێر ، ئەوەنەبێت شەیتان ویستی بە بەردەستمدا بڕوات ،

---

[49] النسائي ، وأحمد بسند صحيح .

[50] البخاري ومسلم وأبو يعلى ( ٣ / ١١٠٧ ـ مصور المكتب الإسلامي ) .

[51] ابن خزيمة في ( صحيحه : ١ / ٩٥ / ١ ) ، والطبراني ( ٣ / ١٤٠ / ٣ ) والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

[52] أحمد والدارقطني والطبراني بسند صحيح ، وهذا الحديث قد ورد معناه في " الصحيحين " وغيرهما عن جمع من الصحابة ، ئەمەش یەکێکە لەو فەرموودە زۆرانەی کە کۆمەڵەی قادیانیەکان بڕوایان پێ نیە ، چونکە بڕوایان بە جیهانی جنۆکە نیە کە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتدا باسی هاتووە ، ڕێگەشیان لە ڕەدکردنەوەی فەرموودەکاندا زانراوە و ئەوەیە کە ئەگەر لە قورئانی پیرۆزدا بێت ، بە پێچەوانەوە ڕاڤەی دەکەن ، بۆ نموونە : خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ ﴾ ( الجن : ١ ) . دەڵێن : واتە : لە مرۆڤ ! ووشەی ( الجن ) بە هاوشێوەی ووشەی ( الإنس ) دادەنەن ! بەو کردارەشیان دوور کەوتونەتەوە لە زمانەوانی و شەریعەت ، وە ئەگەر لە سوننەت دا بوو : ئەوا واژەیەکی ناڕەوای دەکەن بە پێچەوانەوەی مەبەستی فەرموودەکە ، ئەمە ئەگەر بتوانن ، بەڵام ئەگەر نەیاتوانی وابکەن ئەوا : چەند ئاسانە لە لایان فەرموودەکە رەتبکەنەوە و حوکمی ناڕەوایی بەسەردا بدەن ، با هەموو زانایانی

منيش چنگم له ناقيږى نا تاكو ساردى زمانيم لەسەر دەستم هەست پێكرد ، سوێندبێ بە خوا ئەگەر پاڕانەوەى پەيامبەر ( سُليمان ) ى برام نەبوايە كە پێش من لە خوا پاڕايەوە ، ئەوا ئەو شەيتانە دەبەسترايەوە بە كۆڵەكەيەك لە كۆڵەكەكانى مزگەوت ، تاكو منداڵەكانى مەدينە بەدەوريدا بسووڕايانەوە ، [ بۆيە هەركەس لە ئێوە تواني ڕێبگرێت لەوەى كە كەس بە بەينى ئەو و قيبلەكەيدا بڕوات ، با ئەو كارە ئەنجام بدات ] .

وە دەيفەرموو : " إذا صلى أحدكم إلـى شيء يستره من الناس فأراد أحد أن يجتاز بين يديه فليدفع في نحره [ وليدرأ ما استطاع ] وە لە ڕيوايەتێكى تردا هاتووە : " فليمنعه مرتين " لە ڕيوايەتێكى تريشدا هاتووە : " فإن أبـى فليقاتله فإنما هو شيطان " [٥٣] ، واتە : ئەگەر يەكێك لە ئێوە نوێژى ڕووە و بەربەستێك دەكرد ڕێگربوو لە هاتووچۆى خەڵكى بەبەردستيدا ، وە كەسێك ويستى بە بەردەستيدا تێپەر ببێ ، با دەست بنێ بەسنگيەوە ، [ وە تا دەتوانێ دووری خاتەوە ] لە ڕيوايەتێكى تردا هاتووە : با ڕێى لێ بگرێت ، دوو جار ، ئەگەر هەر سوور بوو لەسەر ڕۆيشتن با لە گەڵيا بجەنگێ ، چونكە ئەوە شەيتانە .

وە دەيفەرموو : " لو يعلم المار بين يدي المصلي ماذا عليه لكان أن يقف أربعين خيراً له من أن يمر بين يديه " [٥٤] ، واتە : ئەگەر ئەو كەسەى كە بە بەردەست نوێژگەردا تێپەر دەبێت بزانێت چەند تاوانى لەسەرە ، ئەوا ئەگەر چل بووەستايە زۆر باشتر بوو بۆى لەوەى كە بەبەر دەستى دا بڕوات .

---

فەرموودەش كۆڕابن لە سەر وەرگرتنى و بە ( صحيح ) ـى بزانن ، و ئوممەتيش لە گەڵ زانايان هاو دەنگ بن ، يان بە ( متواتر ) يش دابنرێت . خواى پەروەردگار هيدايەتيان بدات .

[٥٣] البخاري ومسلم .

[٥٤] البخاري ومسلم ، وهذه الرواية لابن خزيمة ( ١ / ٩٤ / ١ ) .

## چی نوێژ دەبڕێت ، و دەبێتە هۆی بەتاڵ بوونەوەی

وە دەیفەرموو : " يقطع صلاة الرجـــل إذا لم يكن بين يديه كآخرة الرحـــل : المرأة [ الحائض ] [٥٥] والحمار والكلب الأسود " ، واتە : ئەوەی کە نوێژ بە نوێژگەر دەبڕێت و بەتاڵی دەکاتەوە ـ ئەگەر وەکو پاشکۆی زێنی وڵاخی لە بەر دەستدا نـەبێت ـ ئـافرەتی باڵغی پێگەیشتوو ، و گوێدرێژ ، و سەگی ڕەش ، ( أبـــو ذر ) ﷺ : فـەرمووی : ئـەی پەیامبەری خوا ﷺ چ جیاوازیەکیان هەیە ڕەش بێ یان سـوور ؟ ئـەویش فـەرمووی : " الكلب الأسود شيطان " [٥٦] ، واتە : چونکە سەگی ڕەش شەیتانە .

## نوێژکردن ڕووەو گۆڕ

پەیامبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە نوێژ کردن ڕووەو گـۆڕ و فەرموویـەتی : " لا تصلوا إلى القبور ولا تجلـــسوا عليهـــا " [٥٧] ، واتـە : ڕووەو گـۆڕ نویـژ مەکـەن ، و لەسەریشیان دامەنیشن .

---

[٥٥] واتە : ئافرەتی باڵغ بوو ، مەبەست لێرەدا بە ووشـەی ( القطـــع ) : پوچـەڵکردنەوەیە ، بـەڵام : ئـەو فەرموودەیەی کە دەڵێت " لا تقطع الصلاة شيء " فەرموودەیەکی ( ضعيف ) ـە هەروەکو لـــە ( تمام المنة : ص ٣٠٦ ) و جگە لەوێش دا هاتووە .

[٥٦] مسلم وأبو داود وابن خزيمة ( ١ / ٩٥ / ٢ ) . و بڕوانە کتێبـی " تحذير الساجد من اتخـــاذ القبـــور مساجد " و " أحكام الجنائز وبدعها " کە هەردوکیان لە نووسینی خۆمن .

[٥٧] مسلم وأبو داود وابن خزيمة ( ١ / ٩٥ / ٢ ) . و بڕوانە کتێبـی " تحذير الساجد من اتخـــاذ القبـــور مساجد " و " أحكام الجنائز وبدعها " کە هەردوکیان لە نووسینی خۆمن .

## نیەت [ نیازی دڵ ] [٥٨]

وە پەیامبەری خوا ﷺ دەیفەرموو : " إنما الأعمال بالنيات وإنما لكل امرئ ما نوى " [٥٩] ، واتە : هەموو کردەوە و پەرستشەکان تەنها بە نیەتەوە دەبن ، وە هەموو کەسێکیش تەنها ئەوەی بۆ هەیە کە نیەتی لێ هێناوە .

## دابەستنی نوێژ و تەکبیرەی ئیحرام [ الله أكبر ]

پاشان پەیامبەری خوا ﷺ بە ووتنی : ( الله أكبر ) نوێژەکەی دادەبەست [٦٠] ، وە فەرمانیشی بەم کارە کردووە بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ( المسيء صلاته ) ، هەروەك لە پێشدا باسی لێوە کرا و پێی فەرمووی : " إنه لا تتم صلاة لأحد من الناس حتى يتوضأ فيضع الوضوء مواضعه ثم يقول : الله أكبر " [٦١] ، واتە : بێگومان نوێژی هیچ کەسێك درووست نیە ، تاکو هەموو ئەندامەکانی دەست نوێژی نەشوات هەروەکو چۆن فەرمانی پێکراوە ، و پاشان نەڵێ : ( الله أكبر ) .

---

[٥٨] پێشەوا ( النووي ) لە ( روضة الطالبين : ١ / ٢٢٤ ) ـدا فەرموویەتی : " والنية : هي القصد ، فيحضر المصلي في ذهنة ذات الصلاة وما يجب التعرض له من صفاتها ؛ كالظهرية والفرضية وغيرها ، ثم يقصد هذه العلوم قصداً مُقارناً لأول التكبير " .

[٥٩] البخاري ومسلم وغيرهما ، وهو مخرج في " الإرواء " ( ٢٢ ) .

[٦٠] مسلم وابن ماجه ، لەم فەرموودەدا ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەوەی کە پەیامبەری خوا ﷺ نوێژەکەی دەست پێنەکرد بەوەی کە دەڵێن : " نیەتمە نوێژی ... " هتد ، بەڵکو ئەو ووتەیەیان بیدعەیە بە کۆڕای زانایان ، و جیاوازیان لەوەدایە کە ئایا ووتنی چاکە یان خراپە ، بەڵام ئێمە دەڵێن : هەموو بیدعەیەك لە عیبادەتدا گومراییە ، لە بەر گشتێتی ئەو فەرموودەیەی پەیامبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی : " وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار " باسکردنی ئەم بابەتەش بە تێر و تەسەلی ئێرە جێگەی نیە .

[٦١] الطبراني بإسناد صحيح .

وە دەیفەرموو : " مفتاح الصلاة الطهور وتحريمها [٦٢] التكبير وتحليلها التسليم " [٦٣] ، واتە : کلیلی کردنەوەی نوێژ دەست نوێژە ، وە قەدەغەکاری هەموو شتێك کە خوای پەروەردگار قەدەغەی کردوون لە نوێژدا تەکبیرەی ئیحرامە ، وە حەڵاڵکاری هەموو ئەو شتانەش کە خوای پەروەردگار لە دەرەوەی نوێژدا حەڵاڵی کردوون سەلام دانەوەیە .

وە " پەیامبەری خوا ﷺ لە کاتی تەکبیرەی ئیحرامدا دەنگی بەرز دەکردەوە ، بۆ ئەوەی ئەوانەی کە بە دوایدا نویژ دەکەن گوێیان لە دەنگی بێ " [٦٤] .

هەروەها " پەیامبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا کە نەخۆش دەکەوت ، ( أبو بکر ) ﷺ دەنگی بەرز دەکردەوە بۆ ئەوەی دەنگی تەکبیرەکانی پەیامبەری خوایان ﷺ پێبگەیەنێت " [٦٥] .

وە دەیفەرموو : " إذا قال الإمام : الله أكبر فقولوا : الله أكبر " [٦٦] ، واتە : ئەگەر پێشنوێژ ووتی : الله أكبر ، ئێوەش بەدوایدا بڵێن : الله أكبر .

---

[٦٢] ( تحريمها ) واتە : حەرامکردنی ئەو کردارانەی کە خوای پەروەردگار لە نوێژدا حەرامی کردووە ، هەروەها ( تحليلها ) : حەڵاڵکردنی ئەو کردارانەی کە خوای پەروەردگار حەڵاڵی کردووە لە دەرەوەی نوێژدا ، مەبەستیش بە ( تحريم و تحليل ) : ( حەرام و حەڵاڵە ) . هەروەها فەرموودەکە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە دەرگای نوێژ داخراوە و بە دەستنوێژ نەبێت نوێژگەر ناتوانێت بیکاتەوە ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە حەرامکردنەکان بە ( الله أكبر ) کردارەکان لە نوێژدا دەست پێدەکات ، دەرچونیش لێیان بە سەلام دانەوەیە لە نوێژەکەت ، ئەمەش بۆچونی زۆربەی زانایانە ( الجمهور ) .

[٦٣] أبو داود والترمذي والحاكم و صححه ووافقه الذهبي ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٠١ ) .

[٦٤] أحمد والحاكم ، وصححه ؛ ووافقه الذهبي .

[٦٥] مسلم والنسائي .

[٦٦] أحمد والبيهقي بسند صحيح .

## چۆنێتی دەست بەرزکردنەوە

وە " پەیامبەری خوا ﷺ جاری وا هەبوو لە گەڵ تەکبیرەی ئیحرامـدا دەسـتەکانی بەرزدەکردنەوە (٦٧) ، جاری واش هەبوو دوای تەکبیرەی ئیحرام بەرزی دەکردنەوە (٦٨) ، وە جاری تری واش هەبوو لە پێش تەکبیرەی ئیحرام بەرزی دەکردنەوە " (٦٩) .

بە شێوەیەك " بەرزی دەکردنەوە پەنجەکانی دەستی تێیدا دەکردنەوە ، [ بۆ ئەوەی لە یەکتر جیایان بکاتەوە ، وە نەیشی دەبەستن ] " (٧٠) .

وە " تـاکو ئاسـتی شـانەکانی بـەرزی دەکردنـەوە (٧١) ، وە لەوانەشـە بـەرزی بکردنایەتەوە تاکو ئاستی نەرمەی گوێکانی " (٧٢) .

## دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ و فەرمان پێ کردنی

وە " پەیامبەری خوا ﷺ دەستی ڕاستی دەخستە سەر دەسـتی چـەپی " (٧٣) ، وە دەیفەرموو : " إنا معشر الأنبياء أمرنا بتعجيل فطرنا وتأخير سحورنا ، وأن نضع أيـماننا على شـمائلنا فـي الصلاة " (٧٤) ، واتـە : ئێمـە کۆمـەڵی پەیامبـەران فـەرمانمان

(٦٧) البخاري والنسائي .

(٦٨) البخاري والنسائي .

(٦٩) البخاري وأبو داود .

(٧٠) أبو داود وابن خزيمة ( ١ / ٦٢ / ٢ و ٦٤ / ١ ) وتمام ، والحاكم وصححه ، ووافقه الذهبي .

(٧١) البخاري والنسائي .

(٧٢) البخاري وأبو داود .

(٧٣) مسلم وأبو داود ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٥٢ ) .

(٧٤) ابن حبان والضياء بسند صحيح .

پێ‌کراوە بە پەلەکردن لە بەربانگ کردن و دواخستنی پارشێو ، لە گەڵ دانانی دەستی ڕاستمان لەسەر دەستی چەپ لە نوێژدا .

وە " جارێکیان بە لای پیاوێکدا تێپەر دەبێت ، خەریکی نوێژکردنە و دەستی چەپی لەسەر دەستی ڕاستی داناوە ، ئەویش هەردوو دەستی لەسەر یەك لادەبا و جارێکی تر دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دادەنێت " [٧٥] .

---

(٧٥) أحمد وأبو داود بسند صحيح .

# دانانی هەردوو دەست لەسەر سنگ

وە " پەیامبەری خوا ﷺ دەستی ڕاستی دەخستە سەر پشتی دەست و مەچەك و باسكی دەستی چەپی " (٧٦) ، و " فەرمانیشی بە هاوەڵانی كردووە بەو كارە " (٧٧) ، وە " جاری واش هەبوو دەستی چەپی بە دەستی ڕاستی دەگرت " (٧٨) .

وە " پەیامبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی لەسەر سنگی دادەنا " (٧٩) .

(٧٦) أبو داود والنسائي وابن خزيمة ( ١ / ٥٤ / ٢ ) بسند صحيح ، وصححه ابن حبان ( ٤٨٥ ) .

(٧٧) مالك والبخاري وأبو عوانة .

(٧٨) النسائي والدارقطني بسند صحيح ، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی كە دەست گرتن بەو شێوەیە سوننەتە ، وە لە فەرموودەی یەكەمدا دانانی دەست سوننەتە ، كەواتە هەردوو شێوەكە سوننەتن ، بەڵام كۆكردنەوە لە نێوان دانان و گرتندا كە هەندێك لە حەنەفی مەزهەبەكان بە باشیان داناوە ، بیدعەیە ، و شێوەكەشی هەروەكو دەڵێن ئەوەیە : كە دەستی ڕاستی لە سەر دەستی چەپی دابنات ، و بە چەنجە تووتە و پەنجە گەورەكەی دەستی ڕاستی باسكی دەستی چەپی بگرێت ، و سێ پەنجەكەی تری لە سەر دابنات : هەروەكو لە ( حاشية ابن عابدين : ١ / ٤٥٤ ) ـدا هاتووە ، جا بەوە هەڵنەخەڵەتێیت كە هەندێك لە دواییینەكان ووتویانە .

(٧٩) أبو داود وابن خزيمة في صحيحه ( ١ / ٥٤ / ٢ ) وأحمد وأبو الشيخ في ( تاريخ أصبهان : ص ١٢٥ ) ، ( الترمذي ) ش یەكێك لە ( سند ) ـە كانی بە ( حسن ) زانیوە ، و واتاكەشی لە ( الموطأ ) و ( البخاري ) ش لە " صحيح " ـەكەیدا ، ئەگەر كەسێك تێبفكرێت ، وە بە تێر و تەسەلیش لە " أحكام الجنائز " ( ص ١١٨ ) ـدا باسم لە ( سند ) ـەكانی ئەم فەرموودەیە كردووە .

**بیرخستنەوەیەك :** ئەوەی كە سەلمێنراو و واردە لە پەیامبەری خواوە ﷺ دانانی دەستەكانە لە سەر سینگ ، ئەوەش كە پێچەوانەی ئەمە بێت یان ( ضعيف ) ـە یان هیچ بنەوایەكی نیە ، پێشەوا ( إسحاق بن راهويه ) كرداری بەم سوننەتە كردووە هەروەكو ( المروزي ) لە ( المسائل : ص٢٢٢ ) ـدا فەرموویەتی : " إسحاق وەتری پێدەكردین ... و دەستەكانی لە قنووت دا بەرز دەكردەوە ، قونووتیشی پێش كڕنووشەكانی دەكرد ، وە دەستەكانی لە سەر مەمكەكانی یان لە خوار مەمكەكانی دادەنا " ، بە هەمان شێوەش ووتەی ( قاضي

وە " نەهیشی دەکرد لە دانانی دەستەکان لە ئاستی کەلەکە ( الإختصار : واتە : دانانی دەستەکان لەسەر یان لە ئاستی کەلەکە ) لە کاتی نوێژدا " [٨٠] ، و هەر ئەم شێوە دانانەشە نەهی لێ دەکرد [٨١] .

---

عیاض المالكي ) یە لە " مستحبات الصلاة " لە پەرتوكی " الإعلام " ( ص١٥ ـــ الطبعة الثانية ـــ الرباط ) كە فەرموویەتی : " وە دانانی ڕاستە لە سەر پشتی دەستی چەپی لە نزیك گەردندا " .

**نزیكیش لەم ووتەیە :** ئەوەیە كە لە ( عبدالله ) ـی كوڕی پێشەوا ( أحمد ) لە " مسائل " ـەكانیدا لە ( ل : ٦٢ ) ـدا فەرموویەتی : " باوكم بینی ئەگەر نوێژی بكردایە دەستێكی لە سەر دەستەكەی تری دادەنا لە سەرووی ناووكەوە " . وە بڕوانە ( إرواء الغليل : ٣٥٣ ) .

[٨٠] البخاري ومسلم ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٧٤ ) .

[٨١] أبو داود والنسائي وغيرهما .

## تەماشاكردنی شوێنی سوژدە و دڵكزی [ الخشوع ] لەنوێژدا

وە " پەيامبەری خوا ﷺ لە كاتی نوێژكردندا سەريدادەنواند ، وچاوی دەبڕيە زەوی "[٨٢] ، و " كاتێكيش ڕۆشتە كەعبەوە لە شوێنی سوژدەكەی زياتر تەماشای هيچ شوێنێكی تری نەدەكرد تاكو لە كەعبە دەرچوو "[٨٣] ، وە فەرمووی : " لا ينبغي أن يكون في البيت شيء يشغل المصلي "[٨٤] ، واتە : نابێ لە ماڵدا هيچ شتێك هەبێت سەرقاڵی نوێژگەر بكات لە كاتی نوێژەكەيدا .

وە " نەهی دەكرد لە چاو گێڕان بە ئاسماندا "[٨٥] ، وە جەختيشی لەسەر ئەم قەدەغەكردنە دەكرد ، تاكو فەرمووی : " لينتهين أقوام يرفعون أبصارهم إلى السماء في الصلاة أو لا ترجع إليهم [ وفي رواية : أو لتخطفن أبصارهم ] "[٨٦] ، واتە : كۆمەڵە كەسانێك هەن لە كاتی نوێژدا چاو بەئاسماندا دەگێڕن ، واز دەهێنن يان خوای پەروەردگار بينايیان لێبسێنێتەوە .

---

[٨٢] البيهقي والحاكم وصححه وهو كما قال ، و لهذا الحديث شاهد من حديث عشرة من أصحابه ﷺ ، رواه ابن العساكر ( ١٧ / ٢٠٢ / ٢ ) . وانظر ( الإرواء : ٣٥٤ ) .

[٨٣] البيهقي والحاكم وصححه وهو كما قال .

**بيرخستنەوەيەك :** لەم دوو فەرموودەوە ( واتە : ژمارە : ٨٢ ، و ٨٣ ) : ئەوەمان بۆ ئاشكرا دەبێت كە سوننەت ئەوەيە نوێژگەر چاو ببڕێتە شوێنی سوژدەكەی لە زەويدا ، ئەوەش كە هەندێك لە نوێژگەران دەيكەن لە نوقاندنی چاوەكانيان لە نوێژدا ، لە سوننەتدا نيە ، باشترين ڕێچكەو ڕێبازيش ڕێبازەكەی پەيامبەری خوايە ﷺ .

[٨٤] أبو داود وأحمد بسند صحيح ، وهو مخرج في ( صحيح سنن أبي داود : ١٧٧١ ) ، مەبەستيش لە ووشەی ( البيت ) لێرەدا : كەعبەيە ، هەر وەكو هۆكاری ووتنی فەرموودەكە ئاماژەی بۆ دەكات .

[٨٥] البخاري وأبو داود .

[٨٦] البخاري ومسلم والسراج .

وە لە فەرموودەیەکی تردا هـاتووە : " فإذا صليتم فلا تلتفتوا فإن الله ينصب وجهه لوجه عبده في صلاته ما لـم يلتفت " [٨٧] ، واتە : ئەگەر نوێـژتان کـرد ، ئـەوا چـاو مەگێڕن و لامەکەنەوە بەم لاو بەو لادا ، چونکە خوای پەروەردگار ڕوو لە ڕووی بەندەکەی دەکات لە نوێژەکەیدا بەمەرجێ بەندە چاونەگێڕێ بەم لاو بەو لادا ( واتە : لا نەکاتەوە ) .

وە سەبارەت بە لاکردنەوەش دەیفەرموو : " اختلاسٌ يختلسه الشيطان من صلاة العبد " [٨٨] ، واتە : دزی یەکە شەیتان لەنوێژی بەندەکانی خوای پەروەردگار دەیدزێت .

وە فەرموویـەتی : " لا يزال الله مقبلاً على العبد في صلاته ما لم يلتفت فإذا صرف وجهه انصرف عنـه " [٨٩] ، واتـە : خـوای پـەروەردگار ڕووی لـە بەندەکەیـەتی لـە نوێژەکەیدا ، تاکو بەندە ڕووی لێ وەرنەگێڕێت ، ئەگەر بەندە ڕووی وەرگێڕا ، ئـەوا خـوای پەروەردگاریش ڕووی لێ وەردەگێڕێ .

وە " نەهیشی کردووە لە سێ شت : سوژدە بردن وەکو دەنووك دانی کەڵەشێر لە زەوی لـە کاتی خواردنیدا ، وە لە کـاتی تەحییاتەکانـدا دانیـشتنی وەکـو دانیـشتنی سـەگ بێـت ، و لاکردنەوە لە نوێژدا وەکو لا کردنەوەی ڕێوی " [٩٠].

وە دەیفەرموو : " صل صلاة مودع كأنك تراه فإن كنت لا تراه فإنه يراك " [٩١] ، واتە : نوێژێك بکە وەکو نوێژی مـاڵئاوایی کارێـك وابێـت ، هـەروەکو خـوای پـەرەردگار ببینیت ، چونکە ئەگەر تۆ خوای پەرەردگار نەبینیت ، ئەو تۆ دیبینێت .

---

[٨٧] الترمذي والحاكم وصححاه . ( صحيح الترغيب والترهيب : ٣٥٣ ) .

[٨٨] البخاري وأبو داود .

[٨٩] رواه أبو داود وغيره وصححه ابن خزيـمة وابن حبان ( صحيح الترغيب و الترهيب : ٥٥٥ ) .

[٩٠] أحمد وأبو يعلى ، ( صحيح الترغيب و الترهيب : ٥٥٦ ) .

[٩١] الملخص في " أحاديث منتقاة " ، والطبراني والروياني ، والضياء في " المختارة " ، وابن ماجه وأحمد ، وابن عساكر ، وصححه الهيتمي الفقيه في " أسنى المطالب " .

وە دەيفەرموو : " ما من امرئ تحضره صلاة مكتوبة فيحسن وضوءها وخشوعها وركوعها إلا كانت كفارة لما قبلها من الذنوب ما لم يؤت كبيرة وذلك الدهر كله " [٩٢] ، واتە : هيچ موسڵمانێك نيە كاتى نوێژێكى فەرزى بەسەردا بێت ، و دەستنوێژەكەى بە باشى بشوات ، و دڵكزيشى هەبێت ( الخشوع ) ، و كڕنووشەكانيشى بە تەواوى ببات ، ئيللا ئەو نوێژە دەبێتە هۆى لێخۆشبون و كەففارەتى ئەو تاوانانەى پێش ئەو نوێژەى ، بەمەرجێك تاوانێكى گەورەى ئەنجام نەدابێت ، ئەم كردارى لێخۆشبوونەش بۆ هەموو نوێژەكانە بە درێژايى ساڵ .

وە جارێكيان " پەيامبەرى خوا ﷺ كراسێكى گوڵدارى صوفى لەبەردا بوو ، لە نوێژەكەيدا سەيرێكى ئەو گوڵانەى سەر كراسەكەى كرد ، كاتێك كە لە نوێژەكەى بووەوە ، فەرمووى : " اذهبوا بخميصتي [٩٣] هذه إلى أبي جهم وائتوني بأنبجانية [٩٤] أبي جهم فإنها ألهتني آنفاً عن صلاتي ( وفي رواية : فإني نظرت إلى علمها في الصلاة ، فكاد يفتني ) " [٩٥] ، واتە : ئەم كراسە گوڵدارەم بەرن بۆ ( أبي جهم ) ، و كراسە سادەكەى ئەوم بۆ بێنن ، چونكە پێش كەمێك سەرقاڵى كردم لە نوێژەكەم ، وە لە ڕيوايەتێكى تردا هاتووە : چونكە لە كاتى نوێژەكەمدا سەيرى گوڵەكانيم كرد ، وەختبوو تووشى سەرگەردانيم بكات لە نوێژەكەم .

وە " ( عائشة ) كراسێكى گوڵدارى هەبوو لە شوێنێكى ماڵەكەيدا هەڵواسرابوو ، ئەو شوێنە لە شوێنى خۆگۆڕين دەچوو ، يان كۆگا ( مەخزەنێكى ) بچوك بوو ، پەيامبەرى خوا ﷺ لە كاتى نوێژدا ڕووى لەو شوێنە دەكرد ، جارێكيان فەرمووى : "

---

[٩٢] مسلم .

[٩٣] كراسێكە لە ( خز ) ، يان لە صوف دروست كراوە و گوڵدارە .

[٩٤] كراسێكى ئەستورى بێ نەخشە .

[٩٥] البخاري ومسلم ومالك . وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٧٦ ) .

أخريهِ عني ؛ [ فإنه لا تزال تصاويره تعرض لي في صلاتِي ] " [٩٦] ، واتە : دووری خەرەوە لێم ، چونکە وێنەکانی بە بەردەوامی دێنە پێش چاوم لەکاتی نوێژەکانمدا .

وە دەیفەرموو : " لا صلاة بحضرة طعامٍ ولا وهو يدافعه الأخبثان " [٩٧] ، واتە : لە کاتی ئامادەبوونی خواردندا نابێت نوێژ ئەنجام بدرێت ، وە لە کاتێکیشدا کە پیسی و میز زۆری پێهێناون ( واتە : لە کاتی تەنگە تاویدا ) .

---

[٩٦] البخاري ومسلم و أبو عوانة ، لێرەدا پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی بەوە نەکرد ئەو وێنانە دابگیرێن و پارچە پارچە بکرێن ، بەڵکو بەوەوە وەستا کە لابدرێن ، چونکە ـ والله أعلم ـ وێنەی گیانـدار نـەبوون ، بـە بەڵگەی ئەوەی کە پەیامبەری خوا ﷺ هەندێك وێنەی تری پارچە پارچە کردووە ، هـەروەکو لـە چـەندەها فەرموودەدا لە ( صحيح ) ـی ( البخاري ) ، ( مسلم ) ـدا هاتووە ، ئـەوەش ئەیـەوێ زیـاتر بزانێـت لـەم بارەیەوە با بگەڕێتەوە بـۆ ( فتح الباري : ١٠ / ٣٢١ ) ، و ( غاية المرام تخريج أحاديث الحلال و الحـرام : ص١٣١ ـــ ١٤٥ ) .

[٩٧] البخاري ومسلم .

# زیکرەکانی دەست پێکردنی نوێژ

پاشان پەیامبەری خوا ﷺ بەچەند زیکرێکی جۆراوجۆر نوێژی دەست پێدەکرد ، شوکری خوای پەروەردگاری تێدا دەکرد ، و تەمجید و ستایشی خوای پەروەردگاری دەکرد ، وە فەرمانیشی بەو پیاوە کردووە کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ، و پێی فەرموو : " لا تتم صلاة لأحد من الناس حتى يكبر ويحمد الله جل وعز ويثني عليه ويقرأ بما تيسر من القرآن ... " (٩٨) ، واتە : نوێژی هیچ کەسێك تەواو نابێت ، تاکو تەکبیرەی ئیحرام بۆ نوێژ دانەبەستێت ، و شوکر و ستایشی خوای پەروەردگاری تێدا نەکات ، وە چەندی پێکرا قورئان بیخوێنێت .

جارێك ئەمەو جارێکی تر ئەوی تریانی دەخوێندەوە ، و دەیفەرموو :

١ ـ " اللَّهُمَّ باعِدْ بيني وبينَ خَطاياي كما باعَدتَ بينَ المشرقِ والمغرب ، اللَّهُمَّ نقني من خطاياي كما ينقى الثوب الأبيض من الدَّنَس ، اللَّهُمَّ اغسلني من خَطاياي بالماءِ والثلج والبَرَد " ، ئەم زیکرەی لە نوێژە فەرزەکان دا دەخوێندەوە (٩٩) .

٢ ـ " وجهت وجهي للذي فطر السماوات والأرض حنيفا [ مسلماً ] وما أنا من المشركين ، إنَّ صلاتي ونُسكي ومَحيايَ ومَماتِي لله رب العالمين ، لا شريك له وبذلك أمرت وأنا أول المسلمين (١٠٠) ، اللَّهُمَّ أنت الملك لا اله الا أنت ، [ سبحانك و بحمدك

---

(٩٨) أبو داود والحاكم وصححه ، ووافقه الذهبي .

(٩٩) البخاري ومسلم ، ولابن أبي شيبة ( ١٢ / ٢١٠ ) ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٨ ) .

(١٠٠) لە زۆربەی ڕیوایەتەکاندا بەم شێوەیەیە ، وە لە هەندێکیاندا : " وأنا من المسلمين " ، واش دەردەکەوێت کە لە گۆڕانکاری هەندێك لە ڕاویەکان بێت ، هەندێك شت هەن بەڵگەن لە سەر ئەوە ، بۆیە پێویستە لە سەر نوێژگەر بڵێت : " وأنا أول المسلمين " ، و هیچیشی لە سەر نیە ، بە پێچەوانەی هەندێك کەسەوە ، چونکە گومانی ئەوە دەکات کە واتاکەی ئەوە بێت : " من یەکەم کەس دەبم ئەو سیفەتەم تێدا دەبێت ، لە گەڵ بوونی کەسانێکیش پێش من " ، بەڵام وانیە ، بەڵکو وواتاکەی ئەوەیە : دەربڕینی

] أنت ربي وأنا عبدك [١٠١] ظلمت نفسي ، واعترفت بذنبي ، فاغفر لي ذنوبي جميعا ، لا يغفر الذنوب إلا أنت ، واهدني لأحسن الأخلاق ؛ لا يهدي لأحسنها إلا أنت ، واصرف عني سيئها ؛ لا يصرف عني سيئها إلا أنت ، لبيك وسعديك [١٠٢] ، والخير كله في يديك والشر ليس إليك [١٠٣] ، [ واهدي من هديك ] أنا بك وإليك [ لامنجا ولا ملجأ منك إلاّ اليك ] ، تباركت وتعاليت ، أستغفرك وأتوب إليك " .

ئەم زیکرەی لە فەرز و سوننەتەکاندا دەوت [١٠٤] .

---

پێشبڕکێیە لە جیبەجێکردنی ئەو شتانەی کە خـوای پەروەردگار فەرمانی پێکردووە ، هاو شێوەشی : ﴿ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ ﴾ ( الزخـرف : ٨١ ) ، وە موسی ـ علیه السلام ـ فـەرمـوویەتی : ﴿ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ ( الأعراف : ١٤٣ ) .

[١٠١] واتە : جگە لە تۆ ناپەرستم ، ئەمە ووتەی ( الأزهري ) یە .

[١٠٢] واتە : من بەردەوامم لەسەر گوێڕایەڵیت فەرمان لە دوای فەرمان ، لە ( أَلَبَّ بالمقام ) ـەوە وەرگیراوە ، ئەگەر تیایدا مایەوە ، وە " سعديك " ، واتە : یارمەتی دوای یارمەتی بۆ فەرمانەکانت ، شوێن کەوتن دوای شوێن کەوتن بۆ ئەو ئاینەی کە پێی ڕازیت .

[١٠٣] واتە : خراپەکاری نادرێتە پاڵ خوای پەروەردگار ، چونکە لە کردارەکانی خوای پەروەردگار خراپە کاری نیە ، بەڵکو هەموو کردارەکانی چاکەکارییە : چونکە کردارەکانی لە نێوان " دادپەروەری " و " چاکە " و " دانایی " دایە ، ئەوانەش هەموو چاکەن و هیچ خراپەیەکی تێدا نیە ، " والشر إنما صار شـراً لانقطـاع نسبته وإضافته إليه تعالى " . پێشەوا " ابن القيم " ـ بەڕەحمەت بێت ـ فەرموویەتی : " هو سـبحانه خـالق الخير والشر ، فالشر في بعض مخلوقاته لا في خلقه وفعله ، ولهذا تنزه سبحانه عن الظلم الـذي حقيقتـه وضـع الشيء في غير محله ، فلا يضع الأشياء إلا في مواضعها اللائقة بها ، وذلك خير كله ، والشر وضع الشيء في غير محله ، فإذا وضع في محله لم يكن شرّا ، فعلم أن الشر ليس إليه ... ( قال ) : فإن قلت : فلم خلقه وهو شـر ؟ قلت : خلقه له ، وفعله خير لا شر ، فإن الخلق والفعل قائم به سبحانه ، والشر يستحيل قيامه واتصافه به ، وما كان في المخلوق من شر فلعدم اضافته ونسبته إليه ، والفعل والخلق يضاف إليه فكان خيرا " ، وتمام هذا البحث الخطير وتحقيقه في كتابه " شفاء العليل في مسائل القضاء والقدر والتعليل " فراجعه ( ص ١٧٨ ــ ٢٠٦ ) .

[١٠٤] مسلم وأبو عوانة وأبو داود والنسائي وابن حبان وأحمد والـشافعي والطـبراني ، ئـەو کەسـەش ئـەم فەرموودەیەی تایبەت کردووە بە سەنەنەتەوە بە هەڵەدا چووە .

٣ ـ هەروەكو زیكری دووەم جگە لە بڕگەی ( أنت ربي ... هتد ) ، ئەوەشی زیاد دەكرد : " اللَّهُمَّ ! أنت الملك لا إله إلا أنت سبحانك وبحمدك " (١٠٥) .

٤ ـ هەروەكو زیكری دووەم تاكو بڕگەی ( وأنا أول المسلمين ) وە ئەم بڕگەیەشی بۆ زیاد دەكرد " اللَّهُمَّ اهدني لأحسن الأخلاق وأحسن الأعمال لا يهدي لأحسنها إلا أنت ، وقني سيئ الأخلاق والأعمال لا يقي سيئها إلاَّ أنت " (١٠٦) .

٥ ـ " سبحانك (١٠٧) اللَّهُمَّ وبحمدك وتبارك اسمك وتعالى جدك ولا إله غيرك " (١٠٨) .

وە فەرموویەتی : " إن أحب الكلام إلى الله أن يقول العبد : سبحانك اللَّهُمَّ ... " (١٠٩) ، واتە : خۆشەویسترین ووتە و گوفتار لە لای خوای پەروەردگار ئەو ووتەیەیە كە تێیدا بڵێیت : سبحانك اللَّهُمَّ ... هتد .

٦ ـ هەروەكو زیكری پێنجەم لە گەڵ زیادكردنی ئەم بڕگەیە لە كاتی شەونوێژدا بڕگەكەش " لا إله إلا الله ( ثلاثا ) ، الله أكبر كبيراً ( ثلاثا ) " (١١٠) .

---

(١٠٥) النسائي بسند صحيح .

(١٠٦) النسائي والدارقطني بسند صحيح .

(١٠٧) " سبحانك " ، واتە : أسبحك تسبيحا : واتاكەشی : بە پاكت ڕادەگرم لە هەموو كەم و كوڕیەك . و " وبحمدك " ، واتە : ئێمە خەریكی سوپاسگوزاری كردنی تۆین . " وتبارك " ، واتە : ئەگەر ناوی تۆ بهێنرێت بەرەكەت دەخاتە ئەو شتەوە ، وە هەموو خێر وچاكەیەك لە هێنانی ناوی تۆدایە . " جدك " ، واتە : پلە و پایە و دەسەڵاتت بەرزە .

(١٠٨) أبو داود وصححه الحاكم ووافقه الذهبي ، وقال العقيلي (ص ١٠٣ ) : " وقد روي من غير وجه بأسانيد جياد " ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٤١ ) .

(١٠٩) رواه ابن منده في ( التوحيد : ١٢٣ / ٢ ) بسند صحيح ، ورواه النسائي في " اليوم والليلة " موقوفا ومرفوعا كما في " جامع المسانيد " لابن كثير ( ج ٣ / قسم ٢ / ورقة ٢٣٥ / ٢ ) . ثم رأيته في " النسائي " ( رقم ٨٤٩ و ٨٥٠ ) ، فخرجته في ( الصحيحة : ٢٩٣٩ ) .

٧ ـ " الله أكبر كبيرا والحمد لله كثيرا وسبحان الله بكرة وأصيلا " یەكێك لە هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ بەم زیكرە دەستی كرد بە نوێژ و پەیامبەری خواش ﷺ سەبارەت بەم زیكرە فەرمووی : " عجبتُ لها ! فتحت لها أبواب السماء " [١١١] ، واتە : سەرسام بووم پێی ! هەموو دەرگاكانی ئاسمانی بۆ كرایەوە .

٨ ـ " الحمد لله حمدا كثيرا طيبا مباركا فيه " هاوەڵێكی تر بەم زیكرە دەستی كرد بەنوێژ ، دیسان پەیامبەری خوا ﷺ سەبارەت بەمیان فەرمووی : " لقد رأيت اثني عشر ملكاً يبتدرونها أيهم يرفعها " [١١٢] ، واتە : كە تۆ ئەو زیكرەت ووت ، (١٢) دوازدە فریشتەم بینی دەست پێشخەریان دەكرد بۆ بەرزكردنەوەی .

٩ ـ " اللَّهُمَّ لك الحمد ، أنت نور [١١٣] السماوات الأرض ومن فيهن ، ولك الحمد أنت قَيِّمُ [١١٤] السماوات والأرض ومن فيهن ، [ ولك الحمد ، أنت ملك السماوات والأرض ومن فيهن ] ، ولك الحمد ، أنت الحق ، ووعدك الحق ، وقولك حق ، ولقاؤك حق ، والجنة حق ، والنار حق ، والساعة حق ، والنبيون حق ، ومحمد حق ، اللَّهُمَّ ! لك أسلمت ، وعليك توكلت ، وبك آمنت ، وإليك أنبت ، وبك خاصمت ، وإليك حاكمت ، [ أنت ربنا وإليك المصير ، فاغفر لي ما قدمت ، وما أخرت ، وما أسررت ، وما أعلنت ] ، [ وما أنت أعلم به مني ] ، [ أنت المقدم وأنت المؤخر ، [ أنت إلهي ] ، لا إله إلا أنت ، [ ولا حول ولا قوة إلا بك ] " [١١٥] .

---

[١١٠] أبو داود والطحاوي بسند حسن .

[١١١] مسلم وأبو عوانة وصححه الترمذي ، ورواه أبو نعيم في ( أخبار أصبهان : ١ / ٢١٠ ) عن جبير بن مطعم أنه سمع النبي ﷺ يقول ذلك في التطوع .

[١١٢] مسلم وأبو عوانة .

[١١٣] واتە : ڕووناك كەرەوەیان ، وە بە تۆوە هیدایەت دەدرێت .

[١١٤] واتە : پارێزەر و پەروەردگاریان .

[١١٥] البخاري ومسلم وأبو عوانة وأبو داود وابن نصر والدارمي .

وه پەيامبەری خوا ﷺ لەشەو نوێژدا ئەم جۆرە زیکرانەی دەخوێندەوە [١١٦] :

١٠ ـ " اللَّهُمَّ ! رب جبرائيل وميكائيل وإسرافيل ! فاطر السماوات والأرض ! عالم الغيب والشهادة ! أنت تحكم بين عبادك فيما كانوا فيه يختلفون ؛ اهدني لما اختلف فيه من الحق بإذنك ، إنك تهدي من تشاء إلى صراط مستقيم " [١١٧] .

١١ ـ پەيامبەری خوا ﷺ (١٠) جار [ الله أكبر ] ـی دەکرد ، (١٠) جاریش [ الحمد لله ] ـی دەکرد ، (١٠) جاریش [ سبحان الله ] ـی دەکرد ، (١٠) جاریش [ لا إله إلا الله ] ـی دەکرد ، (١٠) جاریش [ أستغفرُ الله ] ـی دەکرد ، وە ـ (١٠) جار ـ دەیفەرموو : " اللهم ! إني أعوذ بك من الضيق يوم الحساب " [١١٨] .

١٢ ـ " سێ جار دەیفەرموو : [ الله أكبر ] ذو الملكوت والجبروت والكبرياء والعظمة " [١١٩] .

---

[١١٦] ئەمەش نابێتە ڕێگری ئەنجامدانی لە نوێژە فەرزەکاندا ، جگە لە پێشنوێژ بۆ ئەوەی درێژی نەکاتەوە لە سەر ئەو کەسانەی کە لە پشتیەوە نوێژ دەکەن .

[١١٧] مسلم وأبو عوانة .

[١١٨] أحمد وابن أبي شيبة ( ١٢ / ١١٩ / ٢ ) وأبو داود و الطبراني في ( الأوسط : ٦٢ / ٢ ) من " الجمع بينه وبين الصغير " بسند صحيح وآخر حسن .

[١١٩] الطيالسي وأبو داود بسند صحيح .

## خوێندنەوە

پاشان پەیامبەری خوا ﷺ پەنای بەخوای پەروەردگار دەگرت ، و دەیفەرموو : " أعوذ بالله من الشيطان الرجيم من همزه [١٢٠] ونفخه ونفثه " [١٢١] ، واتە : پەنا دەگرم بە خوای پەروەردگار لە خراپەی شەیتانی نەفرەت لێ کراوی دورخراو لە ڕەحمەتی خوا ، لە شێتی و فیز زلی و هاندانی بۆ وتنی شیعری خراپ .

وە جاری واش هەبوو ئەم زیادەیەی دەخستە سەری ، و دەیفەرموو : " أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان ... " [١٢٢] .

پاشان ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ ی دەکرد ، و دەنگیشی پێ بەرز نەدەکردەوە [١٢٣] .

---

[١٢٠] هەندێك لە گێڕەرەوەکانی فەرموودەکە بە ( المؤتة ) ، وهو بضم الميم وفتح التاء : کە جۆرێکە لە شێتی ، واتایان کردووە . ( ونفخه ) : گێڕەرەوەی فەرموودەکە بە تەکەبور ( فیز زلی ) واتای کردووە ، و ( نفثه ) : گێڕەرەوەی فەرموودەکە بە شیعر واتای کردووە ، ئەم سێ واتایەش لە فەرموودەی ( مرفوع ) دا بۆ پەیامبەری خوا ﷺ بە ( سند ) ێکی ( صحيح ) ی ( مرسل ) پێمان گەشتووە ، مەبەستیش لە شیعر شیعری خراپە ، چونکە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " إن من الشعر لحكمة " رواه البخاري .

[١٢١] أبو داود وابن ماجه والدارقطني والحاكم وصححه هو وابن حبان والذهبي ، وهو مخرج مع الذي بعده في ( إرواء الغليل : ٣٤٢ ) .

[١٢٢] أبو داود والترمذي بسند حسن ، وبه قال أحمد في ( مسائل ابن هاني : ١ / ٥٠ ) .

[١٢٣] البخاري ومسلم وأبو عوانة والطحاوي وأحمد .

## خوێندنەوەی ئایەت بەئایەت ، و وەستان لەنێوانیاندا

پاشان سورەتی [ الفاتحة ] دەخوێند ، و ئایەتەکانی لە یەك جیا دەکردەوە : ئەوەش بەم شێوەیە : ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ دەوەستێت ، و پاشان دەفەرموێت : ﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ دەوەستێت ، و پاشان دەفەرموێت : ﴿ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ دەوەستێت ، و پاشان دەفەرموێت : ﴿ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴾ ، بەم شێوەیە تاکو کۆتای بە سوورەتەکە دەهێنا ، وە هەموو خوێندنەوەکانی تریشی هەر بەم شێوەیە بوو ، لە کۆتایی هەموو ئایەتێك دەوەستا و نەی دەدا بەدەم ئایەتی دوای خۆیەوە [١٢٤] .

وە هەندێك جاریش ﴿ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴾ ـی بە ﴿ مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴾ دەخوێندەوە [١٢٥] .

---

[١٢٤] أبو داود والسهمي ( ٦٤ ــ ٦٥ ) وصححه الحاكم ووافقه الذهبي ، وهــو مخــرج في ( الإرواء : ٣٤٣ ) ورواه أبو عمرو الداني في ( المكتفى : ٥ / ٢ ) و قال : " ولهذا الحديث طرق كثيرة ، وهو أصل في هذا الباب " ثم قال : " وكان جماعة من الأئمة السالفين والقراء الماضين يستحبون القطع على الآيات ؛ و إن تعلق بعضهنّ ببعض " .

دەڵێم : ئەمە سوننەتێکە زۆربەی خوێنەرانی قورئانی پیرۆز دوورن لێیەوە ، سەرەڕای کەسانێکی تریش جگە لەوان .

[١٢٥] تمام الرازي في " الفرائد " وابن أبي داود في ( المصاحف : ٧ / ٢ ) ، وأبو نعيم في ( أخبار أصفهان : ١ / ١٠٤ ) ، والحاكم وصححه ، ووافقه الذهبي ، وهذه القراءة متواترة كالأولى : ( مالك ) .

## ڕوکنیێتی فاتیحە ، و چاکە و فەزڵەکانی ئەم سورەتە

پەیامبەری خوا ﷺ خوێندنەوەی ئەم سورەتەی لەنوێـژدا زۆر بـە گـەورە دەزانـی بەشێوەیەك ، دەیفەرموو " لا صلاة لمن لا يقرأ [ فيها ] بفاتحة الكتاب [ فـصـاعدا ] " [١٢٦] ، واتە : نوێژی هیچ کەسێك دروست نیە تیایدا سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ بەزیاد لەسەر ئەویشەوە نەخوێنێت .

وە لـە گۆ ( لفظێك ) ـدا هـاتووە : " لا تجـزئ صلاة لا يقرأ الرجل فيها بفاتحـة الكتاب " [١٢٧] ، واتـە : نوێژی لەسـەر ناکەوێت ئەو کەسەی لـەنوێژەکەیدا سورەتی : ﴿ الفاتحة ﴾ نەخوێنێت .

وە هەندێك جار دەیفەرموو : " من صلى صلاة لـم يقرأ فيها بفاتحة الكتاب فهـي خداج [١٢٨] هي خداج هي خداج غير تمام " [١٢٩] ، واتە : هەرکەسێك نوێژ بکات و تیێدا سـورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ نەخـوێنێت ، ئـەوا نوێژەکەی ( خَدَّاج ) ـە ، ( خَدَّاج ) ـە ، ( خَدَّاج ) ـە ، واتە : تەواو نیە .

وە دەیفـەرموو : " قال الله تبارك وتعالى : قسمت الصلاة [١٣٠] ـ يعني الفاتحة ـ بيني وبين عبدي نصفين : فنصفها لي ونصفها لعبدي ولعبدي ما سأل " ، واتـە : خـوای پەروەردگاری کار پڕ بەرەکەت و پایەبەرز ، فەرمووتی : نوێژم کردووەتە دوو بەشـەوە لـە

---

[١٢٦] البخاري ومسلم وأبو عوانة والبيهقي ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٠٢ ) .

[١٢٧] الدارقطني وصححه وابن حبان في " صحيحه " ، وهو مخرج في المصدر السابق .

[١٢٨] واتە : تەواو نیە و کەم و کـوڕی تێدایە ، هەر لە فەرموودەکەدا پەیامبەری خوا ﷺ بە " غير تمام " واژەی کردووە .

[١٢٩] مسلم وأبو عوانة .

[١٣٠] واتە : سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ ، ئەوەش بریتیە لە هێنانەوەی گشتی و مەبەست پێبوونی بەش بۆ بەگەورە دانان [ من إطلاق الكل وإرادة الجزء تعظيماً ] .

نێوان خۆم و بەندەکەم : نیوەی بۆ منە و نیوەکەی تریشی بۆ بەندەکەمە ، بەندەکەشم داوای هەرچی بکات پێی دەبخشرێت " وە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمووویەتی : " اقرؤوا : يقول العبد : ﴿ الحمد لله رب العالمين ﴾ ، يقول الله ـــ تعالى ـــ : حمدني عبدي ويقول العبد : ﴿ الرحمن الرحيم ﴾ ، يقول الله : أثنى علي عبدي ويقول العبد : ﴿ مالك يوم الدين ﴾ ، يقول الله تعالى : مجدني عبدي يقول العبد : ﴿ إياك نعبد وإياك نستعين ﴾ ، قال : فهذه بيني وبين عبدي ولعبدي ما سأل يقول العبد : ﴿ اهدنا الصراط المستقيم صراط الذين أنعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين ﴾ ، قال : فهؤلاء لعبدي ولعبدي ما سأل " [١٣١] ، واتە : بخوێنن : کە بەندەی خوا دەڵێت : ﴿ الحمد لله رب العالمين ﴾ ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت : بەندەکەم شوکری کردم ، وە کە بەندەی خوا دەڵێت : ﴿ الرحمن الرحيم ﴾ ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت : بەندەکەم ستایشی کردم ، وە کە بەندەی خوا دەڵێت : ﴿ مالك يوم الدين ﴾ ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت : بەندەکەم بەگەورەم دەزانێ ، وە کە بەندەی خوا دەڵێت : ﴿ إياك نعبد وإياك نستعين ﴾ ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ئەمەیان لە نێوان من و بەندەکەم دا دەمێنێتەوە ، ئەوەشی کە بەندەکەم داوای دەکات دەستی دەکەوێت ، کە بەندە دەڵێت ﴿ اهدنا الصراط المستقيم صراط الذين أنعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين ﴾ ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت : هەموو ئەوانە بۆ بەندەکەمە وئەوەش کە داوای دەکات بۆی دەبێت ودەستی دەکەوێت .

وە دەیفەرموو : " ما أنزل الله ـــ عزوجل ـــ في التوراة ولا في الإنجيل مثل أم القرآن وهي السبع المثاني [١٣٢] والقرآن العظيم الـذي أوتيتـه ] " [١٣٣] ، واتـە : خـوای

---

[١٣١] مسلم وأبو عوانة ومالك ، وله شاهد من حديث جابر عند السهيلي في ( تاريخ جرجان : ١٤٤ ) .

[١٣٢] پێشەوا " الباجي " فەرمووویەتی : " مەبەستی ئەو ئایەتەیە کە خوای پەروەردگار تیایدا فەرمووویەتی : ﴿ ولقد آتيناك سبعا من المثاني والقرآن العظيم ﴾ ( الحجر : ٨٧ ) . پێی دەوترێت : ( السبع ) ، چونکە حەوت ئایەتە ، وە ( المثاني ) یش : لە بەر ئەوەی کە دووبارە دەکرێتەوە لـە هـەموو رکـاتێکدا ، وە پێی دەووترێت

پـەروەردگـار هیچی نەنـاردۆتە خوارەوە نە لە تەورات و نە لە ئینجیلیشدا وەکو سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ بێت ، هەر ئەویشە حەوتـەی دووبـارە بـووەوە لـە نوێـژدا ، و ئـەو قورئانـە پیرۆزەشە کە پێم بەخشراوە .

فەرمانیشی کردووە بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ، ئەو سورەتە لـە نوێژەکەیدا بخوێنێت [١٣٤] ، بەو کەسەشی کـە توانـای لەبـەرکردن و خوێندنـەوەی نیـە فەرموویەتی : بلّـێ : " سبحان الله ، والحمد لله ، ولا إله إلا الله ، والله أكبر ، ولا حول ولا قوة إلا بالله " [١٣٥] .

وە بەو پیاوەش کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نـەدا فـەرمووی : " فإن كان معـك قرآن فاقرأ به ، و إلا فاحمد الله وكبره وهلله " [١٣٦] ، واتە : ئەگەر قورئانت لەبـەربوو ئەوا بیخوێنەوە ، ئەگینا [ الحمد لله ] ، و [ الله أكبر ] ، و [ لا إله إلا الله ] بلّێ .

---

( القرآن العظيم ) بۆ تایبەت کردنی بەم ناوە ، سەرەڕای ئەوەی کە بە هەموو تایەتێك دەوترێت : ( القـرآن العظيم ) ، هەروەکو بە کەعبە دەوترێت ( بيت الله ) ، سەرەڕای ئەوەی کە هەموو مزگەوتێك مـالّی خوایـە ، بەلاّم ئەو شتە بۆ تایبەت مەندکردن ، و بە گەورە دانانیەتی " .

[١٣٣] النسائي والحاكم وصححه ؛ ووافقه الذهبي .

[١٣٤] البخاري في " جزء القراءة خلف الإمام " بسند صحيح .

[١٣٥] أبو داود وابن خزيمة ( ١ / ٨٠ / ٢ ) والحاكم والطبراني وابن حبان ، وصححه هو والحاكم ، ووافقه الذهبي ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٠٣ ) .

[١٣٦] أبو داود والترمذي وحسنه ، وسنده صحيح ، ( صحيح أبي داود : ٨٠٧ ) .

# نەسخ بوونەوەی قورئان خوێندن لە دوای پێشنوێژ لەو نوێژانەی کە دەنگی تێدا بەرز دەکرێتەوە

لە پێشدا پەیامبەری خوا ﷺ ڕێگەی دابوو بە نوێژگەران بەدوای پێشنوێژدا قورئان بخوێنن ، لەو نوێژانەی کە پێشنوێژ تیایاندا دەنگ بەرزدەکاتەوە ، لە کاتێك دا " لە نوێژی بەیانیاندا بوو ، قورئانی دەخوێند کەچی خوێندنەکەی لەسەر قورس بوو ، دوای ئەوەی کە لە نوێژەکەی بووەوە ، فەرمووی : " لعلكم تقرؤون خلف إمامكم ؟ " ، واتە : لەوانەیە بەدوای پێشنوێژەکەتاندا قورئان بخوێنن ؟ ووتمان : بەڵێ بە پەلە دەخوێنین ( هذّا ) بۆ ئەوەی پیاتا بگەین ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ! ئەویش فەرمووی : " لا تفعلوا إلا [ أن يقرأ أحدكم ] بفاتحة الكتاب ، فإنه لا صلاة لمن لم يقرأ بها " [١٣٧] ، واتە : قورئان نەخوێننەوە جگە لەوەی کە سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ دەخوێنن ، چونکە نوێژی ئەو کەسە دروست نیە کە ئەم سورەتە نەخوێنیتەوە .

پاشان بە تەواوی لێی قەدەغە کردن ، لەو نوێژانەی کە دەنگی تێدا بەرز دەکرێتەوە ، ئەوەش کاتێك بوو " لەو نوێژەی بووەوە کە تێیدا دەنگی بەرزکردبووەوە ، [ لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : نوێژەکە نوێژی بەیانی بوو ] ، فەرمووی : " هل قرأ معي منكم أحد آنفا ؟ فقال رجل : نعم أنــا يا رسول الله ﷺ فقال : إني أقول : [ ما لي أنازع [١٣٨] ؟ ! ] . [ قال أبو هريرة رضي الله عنه ] : فانتهى الناس عن القراءة مع رسول الله ﷺ ــ فيما جهر فيه رسول الله ﷺ بالقراءة ــ حين سمعوا ذلك من رسول الله ﷺ وقرؤوا في أنفسهم سراً فيما لا يجهر فيه الإمام ] " [١٣٩] ، واتە : ئایا لەم نوێژە کە پێشنوێژیم بۆ کردن کەس

---

[١٣٧] البخاري في " جزئه " وأبو داود وأحمد ، وحسنه الترمذي والدارقطني .

[١٣٨] قال الخطابي : " معناه : أداخَلُ في القراءة وأغالَبُ عليه ، وقد تكون المنازعة بمعنى : المشاركة والمناوبة ، ومنه منازعة الناس في الندام " . قلت : ( الندام ) : بكسر النون جمع النديم . والمعنى الثاني هو المتعين هاهنا بدليل انتهاء الصحابة عن القراءة مطلقا ، ولو كان المراد منه المعنى الأول ؛ لما انتهوا عنها ، بل المداخلة فقط كما هو ظاهر .

[١٣٩] مالك والحميدي والبخاري في " جزئه " وأبو داود وأحمد والمحاملي ( ٦ / ١٣٩ / ١ ) وحسنه الترمذي ، وصححه أبو حاتم الرازي وابن حبان وابن القيم .

هەبوو قورئانی لە گەڵمدا خوێندبێتەوە ؟! ، پیاوێك فەرمووی : بەڵێ ئەی پەیامبەری خوا ﷺ من بووم ، ئەویش فەرمووی : بۆیە دەمووت : دیارە کەسێك لەگەڵمدا قورئان دەخوێنێتەوە و لێم تێك دەدات ؟! ( أبو هريرة رضي الله عنه ) فەرمووی : دوای ئەوە خەڵکی وازیان لە قورئان خوێندن هێنا لە گەڵ پەیامبەری خوادا ﷺ لەو نوێژانەی کە پەیامبەری خوا ﷺ دەنگی تیایاندا بەرز دەکردەوە ، کاتێك ئەوەیان لە پەیامبەری خواوە ﷺ بیست ، پاشان بەبێ دەنگی بۆ خۆیان دەیانخوێندەوە لە و نوێژانەی کە پێشنوێژ تیایاندا دەنگ بەرز ناکاتەوە .

وە گوێگرتنی بۆ خوێندنەوەی پێشنوێژ بەتەواوی ( إقتداء ) شوێنکەوتن دانراوە بە پێشنوێژەوە ، و فەرموویەتی : " إنما جعل الإمام ليؤتم به ، فإذا كبر فكبروا ، وإذا قرأ فأنصتوا " [١٤٠] ، واتە : پێشنوێژ بۆ ئەوە دانراوە کە چاوی لێبکەن و شوێنی بکەون ، بۆیە ئەگەر تەکبیرەی ئیحرامی دابەست ئێوەش بەدوایدا تەکبیرە دابەستن ، وە ئەگەر قورئانی خوێند ئەوا ئێوە گوێ بگرن بۆ پێشنوێژەکەتان .

هەروەها گوێگرتنی نوێژگەرانی بۆ پێشنوێژ بەوە دانراوە کە جێگەی خوێندنەوەی نوێژگەرانی دوای پێشنوێژ بگرێتەوە ، وە پێویست نەکات جارێکی تر دووبارەی بکەنەوە ، وە فەرمویەتی : " من كان له إمام فقراءة الإمام له قراءة " [١٤١] ، واتە : هەرکەسێك پێشنوێژی هەبوو ، ئەوا خوێندنەوەی پێشنوێژەکەی خوێندنە بۆ ئەویش ، ئەمە لەو نوێژانەدایە کە دەنگیان تیادا بەرزدەکرێتەوە .

---

[١٤٠] ابن أبـي شيبة ( ١ / ٩٧ / ١ ) وأبو داود ومسلم وأبو عوانة والروايات في ( مسنده : ٢٤ / ١١٩ / ١ ) ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٣٢ و ٣٩٤ ) .

[١٤١] ابن أبي شيبة ( ١ / ٩٧ / ١ ) الدارقطني وابن ماجه والطحاوي وأحمد من طرق كثيرة مسند ومرسلة ، وقواه شيخ الإسلام ابن تيمية كما في " الفروع " لابن عبدالهادي ( ق ٤٨ / ٢ ) ، وصحح بعض طرقه البوصيري ، وقد تكلمت عليه بتفصيل وتتبعت طرقه في " الأصل " ثم في ( إرواء الغليل : ٥٠٠ ) .

## پێویست بوونی خوێندنەوەی قورئان لەو نوێژانەی کە لە دوای پێشنوێژەوە دەنگیان تیادا بەرز ناکرێتەوە ،

بەڵام لەو نوێژانەی کە دەنگیان تێدا بەرز ناکرێتەوە ، پەیامبەری خوا ﷺ خوێندنەوەی نوێژگەرانی بە دوای پێشنوێژ بۆ پەسەندکردوون و نکوڵی لەسەر نەکردوون ( واتە : أقرَّهم ) ، ( جابر ) ﷺ لەو بارەیەوە فەرموویەتی : " كنا نقرأ في الظهر والعصر خلف الإمام في الركعتين الأولين بفاتحة الكتاب وسورة ، وفي الآخرين بفاتحة الكتاب " [١٤٢] ، واتە : ئێمەی هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا بە دوای پێش نوێژدا لە ڕکاتی یەکەم و دووەمدا ، سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ ، و سورەتێکی ترمان دەخوێندەوە ، و لە دوو ڕکاتی کۆتاییشدا سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ مان دەخوێندەوە .

ئەوەش کە پەیامبەری خوا ﷺ نکوڵی لەسەر کردون ، ئەوە بوو کە سەرقاڵی نەکەن بە دەنگ بەرزکردنەوەیان بە قورئان ، ئەوەش لە کاتێك دا بوو کە نوێژی نیوەڕۆی ئەنجام دەدا بەهاوەڵانی و فەرمووی : " أيكم قرأ سبح اسم ربك الأعلى ؟ " ، واتە : کێ بوو لە ئێوە سورەتی ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴾ ی خوێندەوە ؟ پیاوێك لە هاوەڵانی فەرمووی : من بووم ئەی پەیامبەری خوا ﷺ [ نیازیشم هیچ نەبوو جگە لە خێر نەبێت ] ، ئەویش فەرمووی : " قد عرفتُ أنَّ رجلاً خالجنيها " [١٤٣] ، واتە : دەمزانی کەسێك هەیە لێم تێك دەدات ، و سەرقاڵم دەکات بە دەنگ بەرزکردنەوەکەی لە کاتی قورئان خوێندندا .

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە " هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ بەدەنگی بەرز لە دوای پەیامبەری خواوە ﷺ قورئانیان دەخوێندەوە ، پەیامبەری خواش ﷺ پێی فەرموون : " خلطتم عليَّ القرآن " [١٤٤] ، واتە : قورئانەکەتان لێ تێکەڵ کردم .

---

[١٤٢] ابن ماجه بسند صحيح ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٥٠٦ ) .

[١٤٣] مسلم وأبو عوانة والسراج . و ( الخلج ) : الجذب والنزع .

[١٤٤] البخاري في " جزئه " وأحمد والسراج بسند حسن .

وە دەیفەرموو : " إن المصلي يناجي ربه ، فلينظر بما يناجيه به ، ولا يجهر بعضكم على بعض بالقرآن " (١٤٥) ، واتە : نوێژگەر لە گەڵ پەروەردگاریدا دەدوێ ، و لێی دەپارێتەوە ، بابزانێت بە چ وتە و گوفتارێك لە گەڵیا دەدوێت ، کەسیش لە ئێوە دەنگی قورئان خوێندنەوەی بەسەر ئەویترتاندا بەرز نەکاتەوە .

وە دەیفەرموو : " من قرأ حرفا من كتاب الله فله به حسنة ، والحسنة بعشر أمثالها ، لا أقول : ﴿ الم ﴾ حرف ؛ ولكن ( ألف ) حرف ، و ( لام ) حرف ، و ( ميم ) حرف " (١٤٦) ، واتە : بۆ هەر پیتێك لە پیتەکانی قورئانی پیرۆز چاکەیەك هەیە بۆ ئەو کەسەی کە دەیخوێنێتەوە ، هەموو چاکەیەکیش بە ( ١٠ ) دە ئەوەندەی خۆی پاداشت دەدرێتەوە ، من نالێم : ﴿ الم ﴾ پیتێکە ، بەڵکو ( ئەلیف ) پیتێکە ، و ( لامیش ) پیتێکە ، و ( میمیش ) پیتێکە .

---

(١٤٥) مالك و البخاري في " أفعال العباد " بسند صحيح .

فائدة : وقد ذهب إلى مشروعية القراءة خلف الإمام في السرية دون الجهرية ، الإمام الشافعي في القديم ، ومحمد تلميذ أبي حنيفة في رواية عنه اختارها الشيخ علي القاري وبعض مشايخ المذهب ، وهو قول الإمام الزهري ومالك وابن المبارك وأحمد بن حنبل وجماعة من المحدثين وغيرهم ، وهو اختيار شيخ الإسلام ابن تيمية .

(١٤٦) الترمذي والحاكم بسند صحيح ، ورواه الآجري في " آداب حملة القرآن " . وهو مخرج في ( الصحيحة : ٦٦٠ ) .

بەڵام سەبارەت بەو فەرموودەیەی کە تیایدا هاتووە : " من قرأ خلف الإمام مُلِيءَ فوهُ ناراً " ؛ ئەوا " موضوع " ـە و لە ( سلسلة الأحاديث الضعيفة : ٥٦٩ ) ـدا باسم لێوە کردووە .

## ووتنی ئامین ، و دەنگ بەرزکردنەوەی پێش نوێژ تێیدا

پاشان ئەگەر پەیامبەری خوا ﷺ کۆتایی بەخوێندنی سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ بهێنایە ، دەیفەرموو : " ئامین و دەنگی تێیدا بەرز و درێژ دەکردەوە " [147] .

وە فەرمانیشی بە موقتەدی [ مأموم ] کردووە کە ئامین بکات ، ئەوەش دوای ووتنی ئامین لە لایەن پێشنوێژەوە و دەیفەرموو : " إذا قال الإمام : ﴿ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ﴾ فقولوا : آمين ، [ فإن الملائكة تقول : آمين وإن الإمام يقول : آمين ] ( وفي لفظ : إذا أمن الإمام فأمنوا ) ، فمن وافق تأمينه تأمين الملائكة ( وفي لفظ آخر : إذا قال أحدكم في الصلاة : آمين ، والملائكة في السماء : آمين ، فوافق إحداهما الآخر ) غفر له ما تقدم من ذنبه " [148] ، واتە : ئەگەر پێشنوێژ ووتی : ﴿ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ﴾ ، بڵێن : ئامین ، چونکە فریشتەکانی خوای پەروەردگاریش دەڵێن : ئامین ، وە پێش نوێژیش دەڵێت : ( ئامین ) ، لە گۆ ( لفظ ) ێکی تردا هاتووە : ئەگەر پێشنوێژ ئامینی کرد لە پاش ئەو ئێوەش ئامین بکەن ) ، چونکە ئەو کەسەی ئامینەکەی لەگەڵ ئامینی فریشتەکانی خوادا هاوکات بوو ( لە گۆ ( لفظ ) ێکی تردا هاتووە : ئەگەر یەکێ لە ئێوە لە نوێژدا ووتی : ئامین ، فریشتەکانی خوای پەروەردگاریش ووتیان : ئامین ، هەردووکیان هاوکات بوون لەگەڵ یەکدا ویەکیان گرت ) ئەوا خوای پەروەردگار لە هەموو گوناهەکانی ئەو کەسە خۆش دەبێت .

---

(١٤٧) البخاري في " جزء القراءة " وأبو داود بسند صحيح .

(١٤٨) البخاري ومسلم والنسائي ، والدارمي ، والزيادة للأخيرين ، وعزاها الحافظ في " الفتح " لأبي داود أيضا وهو وهم ، وهي تبطل الاحتجاج بالحديث على أن الإمام لا يؤمن ، كما يروى عن مالك ، ولذلك قال الحافظ : " وهو صريح في كون الإمام يؤمن " .

قلت : ويشهد له اللفظ الثاني . قال ابن عبدالبر في ( التمهيد : ٧ / ١٣ ) : " وهو قول جمهور المسلمين ، ومنهم مالك في رواية المدنيين عنه ، لصحته عن رسول الله ﷺ من حديث أبي هريرة ( يعني هذا ) ووائل بن حجر " يعني الذي قبله .

وە لە فەرمووودەیەکی تردا هـاتووە : " فقولوا : آمين يجبكم الله " [١٤٩] ، واتـە : بڵـێن ئامین خوای پەروەردگار وەڵامتان دەداتەوە .

وە دەیفـەرموو : " ما حسدتكم اليهود على شيء ما حسدتكم على السلام والتأمين [ خلف الإمام ] " [١٥٠] ، واتە : جوولەکە لە هیچ شتێکدا ئیرەیی پێنەبردوون وەکو ئیرەییتـان پێدەبـەن لە سەلام کردن ، و ئامین کردنتان لە دوای پێشنوێژدا .

---

[١٤٩] مسلم وأبو عوانة .

[١٥٠] البخاري في " الأدب المفرد " ، وابن ماجه وابن خزيمة وأحمد والسراج بسندين صحيحين .

**سوودێك** : ووتنی ئامین لە پاش پێشنوێژەوە ئەبێ بە ئاشکرا و لەگەڵ ئامینی پێشنوێژ بێت ، وە نابێ پێشی بکەوین بە ووتنی ئامین هەروەکو کرداری زۆربەی موسڵمانانە ، وە ناشبێ لێی دوابکەوین ، ئەمەش دوا وتەیـە کە بەڕەوای دەزانم ، و لە زۆر لە نووسراوەکانمدا باسم لێوە کردووە ، لـەوانـە : ( سلسلة الأحاديث الضعيفة : ٩٥٢ ) ، و ( صحيح الترغيب والترهيب : ١ / ٢٠٥ ) .

## قورئان خوێندنەوەی پەیامبەر ﷺ دوای سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾

پاشان پەیامبەری خوا ﷺ لە پاش خوێندنەوەی سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ سورەتێکی تریشی - جگە لە ﴿ الفاتحة ﴾ ی - دەخوێندەوە ، بە شێوەیەك هەندێك جار درێژی دەکردەوە ، هەندێك جاریش کورتی دەکردەوە ، لەبەر هۆکاری گوزەر [ السفر ] و کۆکە [ سعال ] ، و نەخۆشی ، و گریانی منداڵێك ، هەروەکو ( أنس ) ی کوری ( مالك ) ﷺ فەرموویەتی : " رۆژێکیان پەیامبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی کورت کردەوە ( جوَّز ) "[151] ( وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە : نوێژی بەیانی ئەنجامدا ، کورت ترین دوو سورەتی قورئانی پیرۆزی خوێندەوە ، پێیان وت : ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ! بۆچی نوێژەکەت کورت کردەوە ؟! ئەویش فەرمووی : " سمعت بكاء صبي فظننت أن أمه معنا تصلي فأردت أن أفرغ له أمه "[152] ، واتە : گوێم لە گریانی منداڵێك بوو ، گومانی ئەوەشم هەبوو کە دایکی لە گەڵماندا بێت لە نوێژدا ، بۆیە ویستم دایکی زوو لە نوێژ بکەمەوە ، بۆ ئەوەی بڕوات بۆ لای .

وە دەیفەرموو : " إني لأدخل في الصلاة وأنا أريد إطالتها ، فأسمع بكاء الصبي ، فأتجوز في صلاتي مما أعلم من شدة وجد أمه من بكائه "[153] ، واتە : جاری وا هەیە کە نوێژ دادەبەستم نیەتی ئەوەم هەیە نوێژەکەم درێژ بکەمەوە ، بەڵام گوێم لە گریانی منداڵێك دەبێت ، لەو

---

[151] واتە : کورتی کەرەوە ، لەم فەرموودەیە ، و هاوشێوەکانی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ڕێگەدراوە بە منداڵ بردن بۆ مزگەوت ، سەبارەت بەو فەرموودەیەی کە لەسەر زمان بەربڵاوە کە تێیدا هاتووە : " جنبوا مساجدكم صبيانكم ... " فەرموودەکە ( ضعيف ) ە و ناکرێت بە بەڵگە بە کۆڕای زانایان ، لەوانەش کە بە ( ضعيف ) یان داناوە ( ابن الجوزي ) و ( المنذري ) و ( الهيثمي ) و ( الحافظ ابن حجر العسقلاني ) و ( البوصيري ) ، وە ( عبدالحق الإشبيلي ) فەرموویەتی : " لا أصل له " .

[152] أحمد بسند صحيح ، والحديث الآخر رواه ابن أبي داود في ( المصاحف : ٤ / ١٤ / ٢ ) .

[153] البخاري ومسلم .

کاتەدا نوێژەکەم کورت دەکەمەوە ، چونکە دەزانم دایکی چ سۆزێکی بۆی هەیە کە گوێی لە گریانی دەبێت .

وە زۆربەی جار لەسەرەتای سورەتەکەوە دەستی پێدەکرد و تەواوی دەکرد [١٥٤] .

وە دەیفەرموو : " أعطوا كل سورة حظها من الركوع والسجود " [١٥٥] ، واتە : هەموو سورەتێك مافی خۆی بەنێ لە کڕنووش ، و سوژدەدا .

وە لە گۆیەکی تردا هاتووە : " لكل سورة ركعة " [١٥٦] ، واتە : هەر سورەتێك و لە ڕکاتێکدا بخوێنرێتەوە .

وە هەندێك جار سورەتێکی بەسەر دوو ڕکاتدا دابەش دەکرد [١٥٧] ، وە هەندێك جاریش لە دوو ڕکاتدا هەمان سورەتی دووبارە دەکردەوە [١٥٨] .

وە هەندێك جاریش دوو سورەت یان زیاتری لە ڕکاتێکدا کۆدەکردەوە [١٥٩] .

وە پیاوێك لە پشتیوانان لە هاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ هەبوو لە مزگەوتی ( قُباء ) پێشنوێژی موسڵمانانی دەکرد ، هەموو جارێکیش کە بیویستایە سورەتێك لە پاش سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ بخوێنێ ، پێش ئەوە سورەتی : ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ... ﴾ ی دەخوێندەوە تاکۆتایی ، پاشان سورەتەکەی تری لە گەڵدا دەخوێندەوە ، ئەم کارەشی لە هەموو کاتێك دا ئەنجامی دەدا ، هاوەڵانی پێیان ووت : تۆ ئەم سورەتەش دەخوێنی و نازانی تەنها ئەوەت بەسە کەچی سورەتێکی تری بە دوادا دەخوێنیت ، یان دەبێت بە تەنها بیخوێنی یان ئەبێ

---

[١٥٤] زۆر فەرموودە هەن بەڵگەن لە سەر ئەو شتە ، لەوەو دواش هەندێك لەو فەرموودانە باسیان لێوە دەکرێت .

[١٥٥] ابن أبي شيبة ( ١ /١٠٠ / ١ ) وأحمد وعبدالغني المقدسي في ( السنن : ٩ / ٢ ) بسند صحيح .

[١٥٦] ابن نصر والطحاوي بسند صحيح ، واتای فەرموودەکەش لە لای من ئەوەیە کە : هەموو ڕکاتێك سورەتێکی تەواوی تێدا بخوێنرێت ، بۆ ئەوەی بەشی ڕکاتەکە تەواو بێت ! فەرمان پێکردنەکەش حوکمی سوننەتە بەو بەڵگەیەی بە دوای ئەم فەرموودەیەدا دێت .

[١٥٧] أحمد وأبو يعلى من طريقين ، وانظر " القراءة في صلاة الفجر " .

[١٥٨] هەروەکو لە نوێژی بەیانیدا پەیامبەری خوا ﷺ ئەنجامی داوە، لەوەو دوایش باسی لێوە دەکرێت .

[١٥٩] لە باسەکانی دواییشدا بە تێر و تەسەلی باس لە سەنەدەکەی دەکرێت .

وازی لێبهێنیت و سورەتێکی تر بخوێنیت ، ئەویش فـەرمووی : هـەرگیز وازی لێنـاهێنم ، ئەگەر پێتان خۆش بێ پێش نوێژیتان بۆ دەکەم ، ئەگەرنە وازتان لێ ئەهێنم و پێش نوێژیتان ناکەم ، لە بەر ئەوەی هاوەڵانی بەباشترین کەسی ناو خۆیان دەزانـی ، پێیـان نـاخۆش بـوو کەسێکی تر جگە لەو پێشنوێژیان بۆ بکات ، وە کاتێك پەیامبەری خوا ﷺ هات بۆ لایان ئەو هەواڵەیان پێ ڕاگەیاند ، ئەویش فەرمووی : " يا فلان ! ما يمنعك أن تفعل ما يأمرك به أصحابك ؟ وما يحملك على لزوم هذه السورة في كل ركعة ؟ " ، واتە : چی ڕێگرە لەوەی کە داواکاری هاوەڵانت بە جێ بێنیت ؟ وە چی وات لێ دەکات بەردەوام ئەم سورەتە لەهەموو ڕکاتێکدا بخوێنیـت ؟ ئەویش فەرمووی : من ئەم سورەتەم خۆشدەوێت .

پەیامبەری خواش ﷺ پێی فـەرموو : " حبك إياها أدخلـك الجنـة " [١٦٠] ، واتـە : خۆشەویستیت بۆ ئەو سورەتە دەتباتە بەهەشتەوە .

---

[١٦٠] البخاري تعليقا والترمذي موصولا وصححه .

## كۆكردنەوەی پەیامبەری خوا ﷺ
## لە نێوان دوو سورەتی هاوشێوە لە یەك ڕكاتدا

" پەیامبەری خوا ﷺ دوو سورەتی هاوشێوەی یەكتری ( واتە : النظائر ) [١٦١] ـ لە واتادا ـ لە سورەتە درێژەكان لەگەڵ یەكدا كۆدەكردنەوە ، بۆ نمونە : ئەم سورەتانەی لە گەڵ یەكدا دەخوێندەوە :

* سورەتی : ﴿ الرَّحْمَن ﴾ ( ٥٥ : ٧٨ ) [١٦٢] ، لەگەڵ سورەتی : ﴿ النَّجْم ﴾ ( ٥٣ : ٦٢ ) ـدا لەیەك ڕكاتدا پێكەوە كۆدەكردنەوە .

* و سورەتی : ﴿ اقْتَرَبَت ﴾ ( ٥٤ ـ ٥٥ ) لەگەڵ سورەتی : ﴿ الْحَاقَّة ﴾ (٦٩ : ٥٢ ) ـدا لەیەك ڕكاتدا پێكەوە كۆدەكردنەوە .

* و سورەتی : ﴿ الطُّور ﴾ ( ٥٢ : ٤٩ ) لەگەڵ سورەتی : ﴿الذَّارِيَات﴾ ( ٥١ : ٦٠ ) ـدا لەیەك ڕكاتدا پێكەوە كۆدەكردنەوە .

* و سورەتی ﴿ إِذَا وَقَعَت ﴾ ( ٥٦ : ٦٩ ) لەگەڵ سورەتی ﴿ ن ﴾ ( ٦٨ : ٥٢ ) ـدا لەیەك ڕكاتدا پێكەوە كۆدەكردنەوە .

* و سورەتی ﴿ سَأَلَ سَائِلٌ ﴾ ( ٧٠ : ٤٤ ) لەگەڵ سورەتی ﴿ النَّازِعَات ﴾ ( ٧٩ : ٤٦ ) ـدا لەیەك ڕكاتدا پێكەوە كۆدەكردنەوە .

---

[١٦١] واتە : سورەتە هاوشێوەكان لە واتادا ، وەكو ئامۆژگاری و ئەحكام و بەسەرهاتەكان ، ( مفصل ) یش كۆتایی قورئانی پیرۆزە بە یەك دەنگی ، و دەستپێكردنەكەشی سورەتی ( ق ) ـە لە بۆچونی ڕاستدا .

[١٦٢] ژمارەی یەكەم بۆ سورەتەكەیە ، و ژمارەی دووەمیش بۆ ئایەتەكانیانە ، ژماری یەكەم ئەوەی بۆ دەرخستووین كە پەیامبەری خوا ﷺ ڕیزبەندی سەرەتاكانی ڕەچاو نەكردووە لە زۆریەی ئەم سورەتە هاوشێوانەدا ، هەروەكو چۆن لە قورئاندا هاتوون ، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ڕێگە دان بەو كارە ، چەند بەڵگەیەكی تریش دێت هاوشێوەی ئەمانەن وەكو قورئان خوێندن لە شەو نوێژدا ، كە چی ڕەچاوكردنی ڕیزبەندی چاكترە لە نەكردنی .

* و سورەتی : ﴿ وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴾ ( ٨٣ : ٣٦ ) لەگەڵ سورەتی : ﴿ عَبَسَ ﴾ ( ٨٠ : ٤٢ ) ـدا لە یەك ڕكاتدا پێكەوە كۆدەكردنەوە .

* و سورەتی : ﴿ الْمُدَّثِّرُ ﴾ ( ٧٤ : ٥٦ ) لەگەڵ سورەتی : ﴿ الْمُزَّمِّلُ ﴾ ( ٧٣ : ٢٠ ) ـدا لەیەك ڕكاتدا پێكەوە كۆدەكردنەوە .

* و سورەتی ﴿ هَلْ أَتَى ﴾ ( ٧٦ : ٣١ ) لەگەڵ سورەتی ﴿ لَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾ ( ٧٥ : ٤٠ ) ـدا لەیەك ڕكاتدا پێكەوە كۆدەكردنەوە .

* و سورەتی : ﴿ عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ ﴾ ( ٧٨ : ٤٠ ) لەگەڵ سورەتی : ﴿ الْمُرْسَلَاتِ ﴾ ( ٧٧ : ٥٠ ) ـدا لەیەك ڕكاتدا پێكەوە كۆدەكردنەوە .

* و سورەتی : ﴿ الدُّخَانِ ﴾ ( ٥٩ : ٤٤ ) لەگەڵ سورەتی : ﴿ إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴾ ( ٨١ : ٢٩ ) ـدا لەیەك ڕكاتدا پێكەوە كۆدەكردنەوە [١٦٣] .

وە هەندێك جار چەند سورەتێكی لە حەوت سورەتە درێژەكەی قورئان ( السبع الطوال ) پێكەوە كۆدەكردنەوە ، وەكو : سورەتی : ﴿ البقرة ﴾ ، و ﴿ النساء ﴾ ، و ﴿ آل عمران ﴾ ـی لەیەك ڕكاتدا ، ئەوەش لە شەو نوێژەكانیدا بوو ، هەروەكو لە دواییدا باسی لێوە دەكەین ، وە دەیفەرموو : " أفضل الصلاة طول القيام " [١٦٤] ، واتە : باشترین نوێژ ئەو نوێژەیە كە وەستانەكەی درێژبێت .

وە " كاتێك لە خوێندنەوە بگەشتایە : ﴿ أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى ﴾ دەیفەرموو : " سبحانك فبلى " ، واتە : پاكی و بێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگارم بەڵێ ، وە ئەگەر ئەم ئایەتەی بخوێندایەتەوە : ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴾ دەیفەرموو : " سبحان ربي الأعلى " [١٦٥] ، واتە : پاكی و بێگەردی بۆ پەروەردگارم ، پەروەردگاری پایە بەرزم .

---

[١٦٣] البخاري ومسلم .

[١٦٤] مسلم والطحاوي .

[١٦٥] أبو داود والبيهقي بسند صحيح ، ئەو حوكمەش گشتی یە ، بۆیە خوێندنەوە دەگرێتەوە لە نوێژدا بێت یان لە دەرەوەی نوێژ ، سوننەت بێت یان فەرز ، ( ابن أبي شيبة : ٢ / ١٣٢ / ٢ ) ـەش ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە كە ( أبو موسى الأشعري ) و ( مغيرة ) لە نوێژە فەرزەكاندا ئەوەیان دەوت ، وە لە ( عمر ) و ( علي ) یەوە دەیگێڕێتەوە كە بە گشتی وەتویانە .

## ڕەوایە بۆ نوێژ کەر تەنها سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ بخوێنێت لە نوێژەکەیدا

" ( معاذ ) ﷺ نوێژی عیشای لە گەڵ پەیامبەری خوادا ﷺ دەکرد ، پاشان دەگەڕایەوە و نوێژی بە هاوەڵانی دەکرد ، شەوێکیان دەگەڕێتەوە و نوێژیان پێ دەکات ، گەنجێکیش لە هۆزەکەی ( لە هۆزی ( سلمة ) بەناوی : ( سُلیم ) ، لە گەڵیدا نوێژ دەکات ، کە ( معاذ ) ﷺ نوێژەکەی درێژ دەکاتەوە ، ئەو گەنجە خۆی جیا دەکاتەوە و ( لە لایەکی مزگەوتەکە ) نوێژەکەی بە تەنهایی ئەنجام دەدات ، و پاشان ڕەشمەی وشترەکەی دەگرێت و دەڕوات ، کاتێکیش کە ( معاذ ) یش ﷺ لە نوێژەکەی دەبێتەوە ئەوەی بۆ باس دەکرێت ، ئەویش دەفەرموێت : ئەوە سیفەتی دوو ڕوویی تێدایە ! بۆیە ئەبێ ئەو کردارەی بە پەیامبەری خوا ﷺ بگەیەنم ، گەنجەکەش وتی : منیش ئەبێ ئەوەی کە ئەنجامی داوە بە پەیامبەری خوا ﷺ بگەیەنم ، کە ڕۆژ بووەوە هەردووکیان ڕۆشتنە لای پەیامبەری خوا ﷺ ( معاذ ) یش ﷺ ئەوەی کە گەنجەکە ئەنجامی دابوو بە پەیامبەری خوای ﷺ ڕاگەیاند ، گەنجەکەش وتی : ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ! لە لای تۆ زۆر ئەمێنێتەوە ، پاشان کە دەگەڕێتەوە دیسان لەسەر ئێمەی درێژ دەکاتەوە ، پەیامبەری خواش ﷺ بە ( معاذ ) ﷺ فەرمووی : " أفتان أنت یا معاذ ؟ " ، واتە : تۆ ئەتەوێ خەڵکی تووشی فیتنە بکەی ئەی ( معاذ ) ؟ وە بە گەنجەکەی فەرموو ( للفتی ) [١٦٦] : " کیف تصنع أنت یا ابن أخي إذا صلیت ؟ " ، واتە : برازای شیرینم ئەی تۆ چۆن دەکەیت لە کاتی نوێژەکەت دا ؟ لە وەڵامدا وتی : سورەتی : ﴿ الفاتحة ﴾ دەخوێنمەوە ، و داوای بەهەشتیش لە خوای پەروەردگار دەکەم ، و پەناشی پێ دەگرم لە ئاگری دۆزەخ ، و تێش ناگەم لەو ورتە ورتە ( الدندنة ) [١٦٧] و

---

[١٦٦] لە بنەڕادا : ( الفتی ) یە .

[١٦٧] ( الدندنة ) : واتە : ئەگەر مرۆڤ وتەیەك بڵێت گوێت لە ورتە ورتێك بێت ، کەچی واتاکەی تێنەگەیت ، ئەوەش هەندێك لە ( هینمة ) زیاترە . " نهایة " .

باسەی تۆ و ( معاذ ) یش ! پەیامبەری خواش ﷺ فـەرمووی : " إني ومعاذ حول هاتين أو نحو ذا " ، ڕاوی دەڵێت : گەنجەکە وتی : ( معاذ ) ئـەو کاتـە دەزانێـت کـە دێتـەوە نـاو هۆزەکەی و پێیان وترا : دوژمن هاتووە . دەڵێت : کە دوژمن دێت گەنجەکە شەهید دەبێت ، پەیامبەری خواش ﷺ پاش ئەوە دەفەرموویت : " ما فعل خصمي وخصمك ؟ " ئـەویش فەرمووی : ئەی پەیامبەری خـوا ﷺ ئەو ڕاستی لەگەڵ خوای خۆیدا کرد و شەهید کرا ، بەڵام من ڕاستم نەکرد " [١٦٨] .

---

[١٦٨] ابن خزيمة في ( صحيحه : ١٦٣٤ ) والبيهقي بسند جيد ، وموضع الشاهد عند أبي داود ( ٧٥٨ — صحيح أبي داود ) ، وأصل القصة في " الصحيحين " ، والزيادة الأولى لمسلم في رواية ، والثانية لأحمد ( ٥ / ٧٤ ) ، والثالثة والرابعة للبخاري ، وفي الباب عن ابن عباس : " أن رسول الله ﷺ صلى ركعتين لم يقـرأ فيهما إلا بفاتحة الكتاب " . أخرجه أحمد ( ١ / ٢٨٢ ) والحارث بن أبي أسامة في " مسنده " ( ص ٣٨ مـن زوائده ) والبيهقي ( ٢ / ٦٢ ) بسند ضعيف ، وكنت حسنته في الطبعات السابقة ، ثم تبين لي أني كنت واهماً ؛ لأن مداره على حنظلة الدوسي وهو ضعيف ، ولا أدري كيف خَفِيَ عليَّ هذا ؟ ولعلي ظننته ، وعلى كـل حال ؛ فالحمد لله الذي هداني لمعرفة خطئي ، ولذلك بادرت إلى الضرب عليه في الكتاب ، ثم عوضني الله خيراً منه حديث معاذ هذا ، فإنه يدل على ما دلّ عليه حديث ابن عباس ، والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات .

## دەنگ بەرزکردنەوە و بەرزنەکردنەوەی لە نوێژە فەرزەکان و جگە لەوانیش

پەیامبەری خوا ﷺ لە کاتی خوێندنەوەی قورئانی نوێژی بەیانی ، و لە دوو ڕکاتە یەکەمینەکانی نوێژی : ( المغرب ) ، و ( العشاء ) ـدا دەنگی بەرز دەکردەوە ، و لە ڕکاتی سێیەمی ( المغرب ) ، و سێیەم و چوارەمی ( العشاء ) ـدا ، دەنگی بەرز نەدەکردەوە [١٦٩] .

هاوەڵانیشی - ڕەزای خوایان لێ بێ - بە جوولەی ڕیشی پەیامبەری خواوە ﷺ دەیانزانی کە پەیامبەری خوا ﷺ قورئان دەخوێنێتەوە لەو نوێژانەی کە دەنگی تێدا بەرز نەدەکردەوە [١٧٠] ، جار جاریش ئایەتێکی بە دەنگی بەرز دەخوێندەوە بۆ ئەوەی بزانن کە قورئان دەخوێنێتەوە [١٧١] .

هەروەها لە نوێژی هەینی ، و لە دوو نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان [١٧٢] ، ولە نوێژە بارانە [١٧٣] ، و لە نوێژی خۆر ومانگ گیرانیشدا [١٧٤] دەنگی پێ بەرز دەکردەوە .

---

[١٦٩] ئەمە کۆڕا ( إجماع ) ـی موسڵمانانی لە سەرە ، پاشینە ( الخلف ) لە پێشینەوە ( السلف ) دەیگێڕێتەوە ، لەگەڵ هەموو ئەو فەرموودە ( صحیح ) ـانەی کە بەڵگەن لە سەری ، هەروەکو پێشەوا ( النووي ) فەرموویەتی ، هەندێك لەو بەڵگانە لە دواییدا دێن ، وە بڕوانە ( الإرواء : ٣٤٥ ) .

[١٧٠] البخاري وأبو داود .

[١٧١] البخاري ومسلم .

[١٧٢] بڕوانە خوێندنەوەی پەیامبەری خوا ﷺ لە " نوێژی هەینی " و " نوێژی دوو جەژنەکە " .

[١٧٣] البخاري وأبو داود .

[١٧٤] البخاري ومسلم .

## دەنگ بەرز کردنەوە و نزمکردنەوەی لە قورئان خوێندنەوەی شەونوێژدا [١٧٥]

بەڵام سەبارەت بە قورئان خوێندنەوەی لە شەو نوێژدا : جاری وا هەبوو دەنگی تێدا نزم دەکردەوە ، جاری واش هەبوو دەنگی بەرز دەکردەوە [١٧٦] ، وە " ئەگەر لە ماڵدا بوایە ئەوا بە شێوەیەك دەیخوێندەوە ئەو کەسانەی کە لە ماڵن گوێیان لێ دەبوو " [١٧٧] ، وە " لەوانەشە لەوە زیاتر دەنگی بەرز بکردایەتەوە تاکو ئەوانەش کە لە دەرەوەی ژوورەکەیدان گوێیان لێ بێت " [١٧٨] .

وە بەوەش فەرمانی کردووە بە ( أبو بکر ) ، و ( عمر ) ـ ڕەزای خوایان لێ بێت ـ ، ئەوەش لەکاتێکدا بوو کە شەوێکیان دەردەچێت ، دەبینێ ئەوە ( أبو بکر ) ـە و شەونوێژ دەکات ، و دەنگی تێدا نزم دەکاتەوە ، وە بەلای ( عمر ) ـی کوڕی ( الخطاب ) ـدا تێپەڕی بینی نوێژ دەکات ، و دەنگی تێدا بەرز دەکاتەوە ، کە لە بەیانیدا لە لای پەیامبەری خوا ﷺ کۆبوونەوە فەرمووی : " يا أبا بكر ! مررتُ بكَ وأنتَ تصلي تخفض من صوتك ؟ " . قال : قد أسمعت من ناجيت يا رسول الله ! وقال لعمر : " مررتُ بكَ وأنتَ تصلي رافعاً صوتك ؟ . فقال : يا رسول الله ! أوقظ الوسنان وأطرد الشيطان فقال

---

[١٧٥] ( عبدالحق ) لە ( التهجد : ٩٠ / ١ ) ـدا فەرموویەتی : " بەڵام سەبارەت بە سوننەتەکانی ڕۆژ ، هیچ شتێك وارد نەبووە بە ( صحيح ) ـی لە پەیامبەری خواوە ﷺ کە دەنگی تیایاندا نزمکردبێتەوە ، یان بەرزی کردبێتەوە ، ئاشکراتریش ئەوەیە کە دەنگی تیایاندا نزمکردبێتەوە ، وە لە پەیامبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە جارێکیان بە لای ( عبدالله بن حذافة ) ـدا تێپەر دەبێت لە کاتێکدا نوێژی ڕۆژی دەکرد ، دەنگی تیایدا بەرزکردبووەوە ، ئەویش پێی فەرمووی : " يا عبدالله ! سمع الله ولا تسمعنا " بەڵام فەرموودەکە بە هێز نیە ( ليس بالقوي ) .

[١٧٦] البخاري في " أفعال العباد " ، ومسلم .

[١٧٧] أبو داود والترمذي في " الشمائل " بسند حسن ، فەرموودەکەش لێرەدا ئەوە دەگەیەنێت : کە دەنگی مام ناوەند بوو لە نێوان بەرزکردنەوە و نزمکردنەوەی .

[١٧٨] النسائي والترمذي في " الشمائل " والبيهقي في " الدلائل " بسند حسن .

النبـــي ﷺ : " يا أبا بكر! ارفع من صوتك شيئاً " وقال لعمر : " اخفض من صوتك شيئاً " [١٧٩] ، واتە : ئەى ( أبو بكر ) ئەم شەو بــە لاتــدا تێپــەڕيم شــەونوێژت دەكــرد دەنگت نزم كردبووەوە ؟ فەرمووى : ئەى پەيامبەرى خوا ﷺ ئەوەى كە لە گەڵيدا دەدوام دەيبيستم ، وە بە ( عمر ) ــى فــەرموو : ئــەى ( عمـــر ) ئــەم شــەو بەلاتــدا تێپــەڕيم شەونوێژت دەكرد دەنگت بەرز كــردبــووەوە ؟ فەرمووى : بۆ ئــەوەى خەواڵــوەكان لەخــەو هەستێنم ، و شــەيتانيش دوور بخــەمەوە ، پەيــامبەرى خواش ﷺ پێى فەرموون : ئــەى ( أبو بكر ) تۆ هەندێك دەنگت بەرز بكەرەوە ، وە بە ( عمـــر ) يــشى فــەرموو : تــۆش هەندێك دەنگت نزم بكەرەوە .

وە دەيفــەرموو : " الجاهر بالقرآن كالجاهر بالصدقة والمُسر بالقرآن كالمُسر بالصدقة " [١٨٠] ، واتە : ئەو كەسەى كە لە قورئان خوێندنەكەى دەنگ بەرز دەكاتەوە وەكو ئــەو كەسەيە كە بە ئاشكرا صەدەقە بكات ، وە ئەو كەسەش كــە لــە قورئــان خوێندنەكــەى دەنگ نزم دەكاتەوە وەكو ئەو كەسەيە كە بە نهێنى و شاراوەيى صەدەقە بكات .

---

[١٧٩] أبو داود والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

[١٨٠] أبو داود والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

# ئەو ئایەت و سورەتانەی کە پەیامبەری خوا ﷺ لە نوێژەکانیدا دەیخوێندن

سەبارەت بەو ئایەت و سورەتانەی کە پەیامبەری خوا ﷺ لە نوێژەکانیدا دەیخوێندنەوە ، بەپێی گۆڕانی نوێژە فەرزەکان و نوێژەکانی تر دەگۆڕان ، ئەمەش درێژەی باسی خوێندنەوەکەیەتی ، بە یەکەم نوێژی پێنج فەرزەکە کە نوێژی بەیانیە دەستی پێ دەکەین :

## ١ ـ نوێژی بەیانی :

پەیامبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانیاندا سورەتە درێژەکانی حەوت یەکی کۆتایی قورئانی پیرۆزی ( واتە : الطوال المفصل [١٨١] ) ـی دەخوێندەوە [١٨٢] ، و " هەندێك جاریش سورەتی : ﴿ الْوَاقِعَةُ ﴾ ( ٥٦ : ٩٦ ) و هاوشێوەکانی ئەم سورەتەی لە هەردوو ركاتدا دەخوێندەوە " [١٨٣] .

وە " لە حەججی ماڵ ئاواییدا لە سورەتی : ﴿الطُّورِ﴾ ( ٥٢ : ٤٩ ) ـی خوێندەوە " [١٨٤] .

وە " هەندێك جار سورەتی : ﴿ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ﴾ ( ٥٠ : ٤٥ ) و هاوشێوەکانی لە [ یەکەم ڕکاتدا ] دەخوێندەوە " [١٨٥] .

---

[١٨١] الطوال المفصل : واتە : حەوت یەکی کۆتای قورئانی پیرۆز ، کە سەرەتاکەی لە سورەتی ( ق ) ـەوە دەست پێدەکات بە پێی بۆچونی هەڵبژاردە هەروەکو لە پێشدا ئاماژەمان پێکرد .

[١٨٢] النسائي وأحمد بسند صحيح .

[١٨٣] أحمد وابن خزيمة ( ١ / ٦٩ / ١ ) والحاكم ، وصححه ؛ ووافقه الذهبي .

[١٨٤] البخاري ومسلم .

[١٨٥] مسلم والترمذي ، وهو مخرج مع الذي بعده في ( الإرواء : ٣٤٥ ) .

وە " هەندێك جاریش سورەتە کورتەکانی حەوت یەکی کۆتای قورئانی پیرۆزی دەخوێندەوە ، وەکو سورەتی : ﴿ إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴾ ( ٨١ : ١٥ ) " [١٨٦] .

وە " جارێکیان سورەتی : ﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ ﴾ ( ٩٩ : ٨ ) ـی لە هەردوو ڕکاتەکەدا خوێندەوە ، بەشێوەیەك ڕاوی دەڵێت : جا نازانم : ئایا پەیامبەری خوا ﷺ لە بیری چوەوە بەو شێوەیە خوێندیەوە ؟ یان بە ئەنقەست خوێندیەوە ؟ " [١٨٧] .

وە " جارێکیان لە سەفەریکدابوو سورەتی : ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴾ ( ١١٣ : ٥ ) و سورەتی : ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴾ ( ١١٤ : ٦ ) ـی خوێندەوە " [١٨٨] .

وە بە( عقبة ) ـی کوڕی ( عامر ) ﷺ فەرمووی : " اقرأ في صلاتك المعوذتين [ فما تعوذ متعوذ بمثالهما ] " [١٨٩] ، واتە : لە نوێژەکەتدا هەردوو سورەتی : ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴾ ، و سورەتی : ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴾ بخوێنەوە [ چونکە هیچ پەناگرێك پەنای نەگرتووە بە هاوشێوەیان ] .

وە جاری واش هەبوو لەوە زیاتری دەخوێندەوە ، بۆ نمونە : " شەست ئایەت یان زیاتری دەخوێندەوە " [١٩٠] ، هەندێك لە ڕاویەکانی ئەم فەرموودەیە دەڵێن : نازانم ئەو ئایەتانە لە ڕکاتێکدا بوو یان زیاتر ؟

وە " سورەتی : ﴿ الرُّومُ ﴾ ( ٣٠ : ٦٠ ) ـی دەخوێندەوە [١٩١] ، و هەندێك جاریش سورەتی : ﴿ يس ﴾ ( ٣٦ : ٨٣ ) ـی دەخوێندەوە " [١٩٢] .

---

[١٨٦] مسلم وأبو داود .

[١٨٧] أبو داود والبيهقي بسند صحيح ، والظاهر أنه فعل ذلك عمدا للتشريع .

[١٨٨] أبو داود وابن خزيمة ( ١ / ٦٩ / ٢ ) وابن بشران في ( الأمالي ) ، وابن أبي شيبة ( ١٢ / ١٧٦ / ١ ) ، وصححه الحاكم ، ووافقه الذهبي .

[١٨٩] أبو داود وأحمد بسند صحيح .

[١٩٠] البخاري ومسلم .

وە جارێکیان " لە مەککەدا نوێژی بەیانی دەکرد ، دەستی کرد بە خوێندنەوەی سورەتی : ﴿ الْمُؤْمِنُونَ ﴾ ( ٢٣ : ١١٨ ) ، تاکو گەشتە باس و بەسەرهاتی [ موسی ] و [ هارون ] ـ علیهما السلام ـ یان گەشتە باس و بەسەرهاتی [ عیسی ] ـ علیه السلام ـ [١٩٣] هەندێك لە ڕاویەکانی ئەم فەرموودەیە گومانیان لە باس و بەسەرهاتەکە هەبوو ـ پەیامبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا کۆکە گرتی بۆیە کڕنووشی برد " [١٩٤] .

وە " هەندێك جار پێشنوێژی نوێژی بەیانی بۆ دەکردن وسورەتی : ﴿ الصَّافَّاتِ ﴾ ( ٧٧ : ١٨٢ ) ی تیادا دەخوێندەوە " [١٩٥] .

وە " لە ڕۆژانی هەینی و لە نوێژی بەیانی و [ لە ڕکاتی یەکەمدا ] سورەتی : ﴿ ألم تنزيل السجدة ﴾ ( ٣٢ : ٣٠ ) ـەو [ لە ڕکاتی دووەمیشدا ] سورەتی : ﴿ هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ ﴾ ( ٧٦ : ٣١ ) ـی دەخوێندەوە " [١٩٦] .

بەشێوەیەك " ڕکاتی یەکەمی درێژ دەکردەوە و ڕکاتی دووەمی کورت دەکردەوە " [١٩٧] .

---

(١٩١) النسائي وأحمد والبزار بسند جيد ، هذا هو الذي استقر عليه الرأي أخيراً خلافاً لما كنت ذكرته في ( تمام المنة : ص ١٨٥ ) وغيره فليعلم .

(١٩٢) أحمد بسند صحيح .

(١٩٣) سەبارەت بە باس و بەسەرهاتی [ موسی ] ـ علیه السلام ـ لەو ئایەتەدا هاتووە کە خوای پەروەردگار تێیدا فەرموویەتی : ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَارُونَ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴾ ( المؤمنون : ٤٥ ) ، بەلام باس وبەسەرهاتی [ عیسی ] ـ علیه السلام ـ لەو ئایەتەدا هاتووە کە دوای چوار ئایەت دێت لە هەمان سورەتدا کە خوای پەروەردگار تێیدا فەرموویەتی : ﴿ وَجَعَلْنَا ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ آيَةً وَآوَيْنَاهُمَا إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ﴾ ( المؤمنون : ٥٠ ) .

(١٩٤) البخاري تعليقا ، ومسلم ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٩٧ ) .

(١٩٥) أحمد وأبو يعلى في " مسنديهما " والمقدسي في " المختارة " .

(١٩٦) البخاري ومسلم .

(١٩٧) البخاري ومسلم .

## خوێندنەوە لە سوننەتی پێش نوێژی بەیانی

بەلام سەبارەت بە خوێندنەوەی لە دوو ڕکاتی سوننەتی پێش بەیانی ، خوێندنەوەکەی زۆر کورت بوو [١٩٨] ، بەشێوەیەك ( عائشة ) ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ دەیفەرموو : " هل قرأ فيها بأم الكتاب ؟ " [١٩٩] ، واتە : تۆ بڵێی سورەتی : ﴿ الفاتحة ﴾ ی تێدا خوێندبێتەوە ؟

وە " هەندێك جار دوای تەواوکردنی سورەتی : ﴿ الفاتحة ﴾ لە ڕکاتی یەکەمی ئەم سوننەتەدا ئایەتی ( ٢ : ١٣٦ ) : ﴿ قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا ﴾ ی تاکو کۆتایی دەخوێندەوە ، و لە ڕکاتەکەی تردا ( ٣ : ٦٤ ) : ﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ ﴾ ی تاکو کۆتایی دەخوێندەوە " [٢٠٠] .

وە " لەوانەشە لە جێگای ئەم ئایەتەی ( ٢٣ : ٥٢ ) : ﴿ فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ الْكُفْرَ ﴾ ی تا کۆتایی بخوێندایە " [٢٠١] .

وە جاری واش هەبوو : ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴾ ( ١٠٩ : ٦ ) ی لە ڕکاتی یەکەمدا دەخوێندەوە و لە ڕکاتی دووەمیشدا : ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ ( ١١٢ : ٤ ) ی دەخوێندەوە [٢٠٢] ، و دەیفەرموو : " نعم السورتان هما " [٢٠٣] ، واتە : ئەم دوو سورەتە باشترین دوو نیعمەتن .

---

[١٩٨] أحمد بسند صحيح .

[١٩٩] البخاري ومسلم .

[٢٠٠] مسلم وابن خزيمة والحاكم .

[٢٠١] مسلم وأبو داود .

[٢٠٢] مسلم وأبو داود .

[٢٠٣] ابن ماجه وابن خزيمة .

وە " جارێکیان پەیامبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێك دەبێ لە ڕکاتی یەکەمدا سورەتی یەکەم دەخوێنێتەوە ، دەفەرموویت : " هذا عبد آمن بربه " ، واتە : ئەمە بەندەیەکە باوەڕی بە پەروەردگاری خۆی هێناوە ، پاشان سورەتی دووەمی لە ڕکاتی دووەمدا خوێندەوە ، جارێکی تر فەرمووی : " هذا عبد عرف ربه " (٢٠٤) ، واتە : ئەمە بەندەیەکە پەروەردگاری خۆی ناسیوە .

## ٢ ـ نوێژی نیوەڕۆ :

وە " پەیامبەری خوا ﷺ لە دوو ڕکاتە یەکەمینەکانی نوێژی نیوەڕۆدا سورەتی : ﴿ الفاتحة ﴾ ـەی لە گەڵ دوو سورەتدا دەخوێندەوە ، ئەوەندە لەڕکاتی یەکەمدا درێژەی پێدەدا لە ڕکاتی دووەمدا ئەوەندە درێژی نە دەکردەوە " (٢٠٥) .

وە جاری واش هەبوو خوێندنەوەکەی درێژە پێدەدا بە شێوەیەك " ئەگەر پەیامبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی دابەستایە ، و یەکێکیش ئیشی لە بەقیع هەبوایە و بڕۆشتایە بۆ بەقیع ، و ئیشەکەی ئەنجام بدایە ، [ و بشگەڕایەتەوە بۆ ماڵ ] ، و دەست نوێژیشی بگرتایە ، و پاشان بهاتبایەتەوە بۆ مزگەوت دەیبینی پەیامبەری خوا ﷺ هێشتا هەر لە ڕکاتی یەکەمدایە بەهۆی ئەو هەموو درێژکردنەوەی کە لە ڕکاتی یەکەمدا دەیکرد " (٢٠٦) .

وە " هاوەڵانی پەیامبەری خواش ﷺ بەو شێوەیە ئەم کردارەی پەیامبەری خوایان ﷺ لێك دەدایەوە کە پەیامبەری خوا ﷺ دەیەوێت خەڵکێکی زیاتر بگەن بە ڕکاتی یەکەمدا " (٢٠٧) .

---

(٢٠٤) الطحاوي وابن حبان في " صحيحه " وابن بشران ، وحسنه الحافظ في ( الأحاديث العاليات : رقم : ١ ) .

(٢٠٥) البخاري ومسلم .

(٢٠٦) مسلم والبخاري في " جزء القراءة " .

(٢٠٧) أبو داود بسند صحيح وابن خزيمة ( ١ / ١٦٥ / ١ ) .

وە " لە هەر ڕکاتێکدا نزیکەی سی ئایەتی دەخوێندەوە ، بە نزیکەی خوێندنەوەی سورەتی : ﴿ ألم تنزيل السجدة ﴾ ( ۲۲ : ۳۰ ) لە ڕکاتێکدا سورەتی : ﴿ الفاتحة ﴾ شی تێدابێ " (۲۰۸) .

وە هەندێك جار " سورەتی : ﴿ السَّمَاءِ وَالطَّارِقِ ﴾ ، و سورەتی : ﴿ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ ﴾ ، و سورەتی : ﴿ الليل إذا يغشى ﴾ ، و هاوشێوەکانی دەخوێندەوە " (۲۰۹) .

وە لەوانەشە " سورەتی : ﴿ إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ ﴾ ، و هاوشێوەکانی خوێندبێتەوە " (۲۱۰) .

وە " هاوەڵانیشی ـ ڕەزای خوایان لێ بێ ـ بە جوڵەی ڕیشیەوە دەیانزانی کە پەیامبەری خوا ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا قورئان دەخوێنێتەوە " (۲۱۱) .

## خوێندنەوەی پەیامبەری خوا ﷺ بۆچەند ئایەتێك دوابەدوای سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ لە دوو ڕکاتەکانی کۆتایدا

وە " پەیامبەری خوا ﷺ دوو ڕکاتە کۆتاییەکانی ئەوەندە کورت دەکردەوە نزیکەی نیوەی دوو ڕکاتە یەکەمینەکان دەبوون ، کە نزیکەی پانزە ئایەت دەبوون (۲۱۲) ، لەوانەشە تەنها سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ ـی تێدا بخوێندایەن (۲۱۳) .

---

(۲۰۸) أحمد ومسلم .

(۲۰۹) أبو داود والترمذي وصححه وكذا ابن خزيمة ( ۱ / ٦۷ / ۲ ) .

(۲۱۰) ابن خزيمة في ( صحيحه : ۱ / ٦۷ / ۲ ) .

(۲۱۱) البخاري وأبو داود .

(۲۱۲) أحمد ومسلم . وە لە فەرموودەکەدا دەردەکەوێت کە خوێندنی زیاد لە سەر سورەتی [ الفاتحة ] لە دوو ڕکاتی کۆتایی نوێژ سوننەتە ، و هەموو هاوەڵانیش لەسەر ئەوەن ، لەوانەش ( أبوبكر الصديق ) ، ئیمامی ( شافعي ) ش ئەم بۆچونەی هەیە لە نوێژی نیوەڕۆ بێت یان نوێژەکانی تر ، زانایانی پاشینمان ئەم بۆچونەیان هەڵبژاردووە لەوانەش ( أبو الحسنات اللكنوي ) لە " التعليق المجد على موطأ محمد : ص ۱۰۲ ) وە فەرموویەتی : " وأغرب بعض أصحابنا حيث أوجبوا سجود السهو بقراءة سورة في الأخريين ، وقد ردّه

## خوێندنەوەی سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ لە هەموو ڕکاتێکدا واجبە

پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی بەو پیاوە کردووە کە نوێژەکەی بەتەواوی ئەنجام نەدا ( المسيء صلاته ) کە سورەتی : ﴿ الفاتحة ﴾ لە هەموو ڕکاتێکدا بخوێنێتەوە ، ئەوەش لەو وتەیەی دا بوو کە پاش ئەوەی فەرمانی پێکرد کە ئەم سورەتە لە ڕکاتی یەکەمدا بخوێنێتەوە [٢١٤] ، پێی فەرمووی : " ثم افعل ذلك في صلاتك كلها " [٢١٥] ، واتە : پاشان ئەوە ئەنجام بدە لە نوێژەکەتدا بە گشتی . و " لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : في كل ركعة " [٢١٦] ، واتە : لە هەموو ڕکاتێکدا .

وە " جاری واش هەبوو ئایەتێکی بە گوێیاندا دەدا " [٢١٧] .

وە " جاری واش هەبوو گوێیان لە دەنگ خۆشی پەیامبەری خوا ﷺ دەبوو لە کاتی خوێندنەوەی : ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴾ ( ٨٧ : ١٩ ) یان : ﴿ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ ﴾ ( ٨٨ : ٢٦ ) " [٢١٨] .

وە " جاری واش هەبوو سورەتی : ﴿ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ ﴾ ( ٨٥ : ٢٢ ) ، یان سورەتی : ﴿ وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ ﴾ ( ٨٦ : ١٧ ) و هاوشێوەکانی ئەم سورەتانەی دەخوێندەوە " [٢١٨] .

---

شراح " المنية " : إبراهيم الحلبي ، وابن أمير حاج وغيرهما بأحسن رد ، ولا شك في أن من قال بذلك لم يبلغه الحديث ، ولو بلغه لم يتفوه به " .

[٢١٣] البخاري ومسلم .

[٢١٤] أبو داود وأحمد بسند قوي .

[٢١٥] البخاري ومسلم .

[٢١٦] أحمد بسند جيد .

[٢١٧] البخاري ومسلم .

[٢١٨] ابن خزيمة في ( صحيحه : ١ / ٦٧ / ٢ ) والضياء المقدسي في " المختار ة " بسند صحيح .

[٢١٨] البخاري في " جزء القراءة " والترمذي وصححه .

وە " جـاری واش هەبوو سورەتی : ﴿ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى ﴾ ( ٩٢ : ٢١ ) و هاوشێوەکانی ئەم سورەتەی دەخوێندەوە " [٢١٩] .

## ٣ ـ نوێژی عەسر :

وە " پەیـامبەری خوا ﷺ لــە دوو ڕکاتە یەکەمینەکانی نوێژی عەسردا سـورەتی : ﴿ الفاتحة ﴾ ـەی لە گـەڵ دوو سـورەتدا دەخوێنـدەوە ، ئەوەنـدەی لـەڕکاتی یەکەمـدا درێژەی پێدەدا لە دووەمدا ئەوەندە درێژی نە دەکردەوە " [٢٢٠] ، و " هاوەڵاتی پەیامبەری خواش ﷺ بەو شێوەیە ئەم کردارەی پەیامبەری خوایان ﷺ لێك دەدایەوە کە پەیامبەری خوا ﷺ دەیەوێت خەڵکێکی زیاتر بگەن بە ڕکاتی یەکەمدا " [٢٢١] .

وە " لە هەر ڕکاتێکدا نزیکەی پانزە ئایەتی دەخوێندەوە ، بە نزیکـەی نیـوەی ئـەو ئایەتانەی کە لە هەر یەکە لە دوو ڕکاتە یەکەمینەکانی نوێژی نیوەڕۆدا دەیخوێندنەوە " .

وە " پەیامبـەری خـوا ﷺ دوو ڕکاتـە کۆتاییـەکانی ئەوەنـدە کـورت دەکـردەوە ، نزیکەی نیوەی دوو ڕکاتە یەکەمینەکان دەبوون " [٢٢٢] .

وە " لە هەر ڕکاتێکیاندا سورەتی : ﴿ الفاتحة ﴾ ـی دەخوێندەوە " [٢٢٣] .

وە " جاری واش هەبوو ئایەتێکی بە گوێیاندا دەدا " [٢٢٤] .

وە ئەو سورەتانەشی دەخوێندەوە کە لە باسی نوێژی نیوەڕۆدا باسمان لێوەکرد .

## ٤ ـ نوێژی مەغرب :

وە " پەیامبەری خوا ﷺ هەندێك جار ـ لە نوێژی مەغریب دا سورەتە کورتەکانی حەوت یەکی کۆتـای قورئـانی پـیرۆزی دەخوێنـدەوە " [٢٢٥] ، بەشـێوەیەك " هـاوەڵاتی

---

[٢١٩] مسلم والطيالسي .

[٢٢٠] البخاري ومسلم .

[٢٢١] أبو داود بسند صحيح ، وابن خزيمة .

[٢٢٢] احمد ومسلم .

[٢٢٣] البخاري ومسلم .

[٢٢٤] البخاري ومسلم .

پەیامبەری خوا ﷺ کــە نوێــژیان لەگەڵــدا بکردایــە ، پــاش ســەلام دانــەوە ، کــە لــە نوێژدەبوونەوە و دەڕۆشتنەوە شوێنی ڕمەکانی خۆیان لەسەر زەوی دەبینی " [٢٢٦] .

وە " جارێکیان لە ســەفەرێکدا ســورەتی ﴿ وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ﴾ ( ٩٥ : ٨ ) ــی لــە ڕکاتی دووەمدا خوێندەوە " [٢٢٧] .

وە هەندێك جار سورەتە درێژەکانی حەوت یەکی کۆتایی قورئانی پیرۆز و سورەتە مام ناوەنــدیەکانی ، دەخوێندەوە ، بۆ نموونە : " جاری وا هەبوو ﴿ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ ﴾ ( ٤٧ : ٣٨ ) ــی دەخوێندەوە [٢٢٨] ، وە جاری واش هەبوو ســورەتی : ﴿ الطور ﴾ ــی ( ٥٢ : ٤٩ ) دەخوێندەوە [٢٢٩] ، وە لە دوا نوێژەکانی پێش مردنی ﷺ هەنــدێك جــار سورەتی : ﴿ والمرسلات ﴾ ــی ( ٧٧ : ٥٠ ) دەخوێندەوە ، " [٢٣٠] .

وە " هەندێك جاری تر یەکێك لە درێژترین دوو سورەت ( واتە : بطولى الطولين [٢٣١] ) کە سورەتی : ﴿ الأعراف ﴾ ــە ( ٢٠٦ : ٧ ) [ لە دوو ڕکاتدا دەخوێندەوە ] " [٢٣٢] .

وە " جاری واش هەبوو ســورەتی [ الأنفــال ] ــی ( ٨ : ٧٥ ) لــە دوو ڕکاتــدا دەخــوێنــدەوە " [٢٣٣] .

---

[٢٢٥] البخاري ومسلم .

[٢٢٦] النسائي وأحمد بسند صحيح .

[٢٢٧] الطيالسي وأحمد بسند صحيح .

[٢٢٨] ابن خزيمة ( ١ / ١٦٦ / ٢ ) والطبراني والمقدسي بسند صحيح .

[٢٢٩] البخاري ومسلم .

[٢٣٠] البخاري ومسلم .

[٢٣١] أي : بأطول السورتين الطويلتين ، و " الطولى " تأنيث " أطول " ، و " الطولين " : تثنيه طولى ، وهما [ الأعراف ] اتفاقا ، و [ الأنعام ] على الأرجح ؛ كما في " فتح الباري " .

[٢٣٢] البخاري وأبو داود وابن خزيمة ( ١ / ٦٨ / ١ ) وأحمد والسراج والمخلص .

[٢٣٣] الطبراني في " الكبير " بسند صحيح .

## خوێندنەوە لە سوننەتی پاش نوێژی مەغریب

بەڵام سەبارەت بە خوێندنەوەی لە دوو ڕکاتی پاش نوێژی مەغریب ، ئەوا " سورەتی : ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴾ ( : ٦ : ١٠٩ ) ، و : ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ ـى ( ٤ : ١١٢ ) دەخوێندەوە " [٢٣٤] .

### ٥ ـ نوێژی عیشا :

وە " پەیامبەری خوا ﷺ لە دوو ڕکاتە یەکەمینەکانی نوێژی عیشادا ، سورەتە ناوەندیەکانی حەوت یەکی کۆتایی قورئانی پیرۆزی دەخوێندەوە ( واتە : من وسط المفصل ) [٢٣٥] ، بۆ نموونە : هەندێك جار سورەتی : ﴿ وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ﴾ ( ٩١ : ١٥ ) ، وە سورەتە هاوشێوەکانی دەخوێندەوە " [٢٣٦] .

وە " جاری واش هەبوو سورەتی : ﴿ إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ ﴾ ـى ( ٨٤ : ٢٥ ) دەخوێندەوە ، و تیایدا سوژدەی دەبرد " [٢٣٧] .

وە " جارێکیان لە سەفەرێك دا سورەتی : ﴿ وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ﴾ ـى ( ٩٥ : ٨ ) [ لە ڕکاتی یەکەمدا ] خوێندەوە " [٢٣٨] .

وە نەهیشی کردووە لە درێژکردنەوەی قورئان تێیدا ئەوەش لەو کاتەی کە ( معاذ ) نوێژی عیشای بە هاوەڵانی کرد و درێژی کردەوە لەسەریان ، و پیاوێکیش لە ( ئەنصار ) وازی لە نوێژەکەی هێناو بەتەنها نوێژەکەی ئەنجام دا ، کە هەواڵەکەی پێگەیەنرا فەرمووی : ئەوە دوورِوە ، وە کە ووتەکەی ( معاذ ) گەشتە ئەو پیاوە ڕۆشتە لای پەیامبەری خوا ﷺ و

---

[٢٣٤] أحمد والمقدسي والنسائي وابن نصر والطبراني .

[٢٣٥] النسائي و أحمد بسند صحيح .

[٢٣٦] أحمد والترمذي وحسنه .

[٢٣٧] البخاري ومسلم والنسائي .

[٢٣٨] البخاري ومسلم والنسائي .

ئەوەی کە ( معاذ ) پێی وتوبووی پێی ڕاگەیاند ، پەیامبەری خواش ﷺ پێی فەرمووی : " أتريد أن تكون فتاناً يا معاذ ؟ إذا أممت الناس فأقرأ بـ : ﴿ وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ﴾ ( ٩١ : ١٥ ) ، و ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴾ ( ٧٧ : ١٩ ) ، و ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ ﴾ ( ٩٦ : ١٩ ) ، و ﴿ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى ﴾ ( ٩٢ : ٢١ ) [ فإنه يصلي وراءك الكبير و الضعيف و ذو الحاجة ] " [٢٣٩] ، واتە : ئەی ( معاذ ) ئەتەوێ ببیت بە فیتنە ، ئەگەر پێشنوێژیت بۆ موسڵمانان کرد ئەوا سورەتی : ﴿ وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ﴾ ( ٩١ : ١٥ ) و ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴾ ( ٧٧ : ١٩ ) ، و ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ ﴾ ( ٩٦ : ١٩ ) ، و ﴿ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى ﴾ ( ٩٢ : ٢١ ) بخوێنەوە ، چونکە کەسانێکی پیر و لاواز وپێویستیدار بەدواتەوە نوێژ دەکەن .

### ٦ ـ شەونوێژ :

" پەیامبەری خوا ﷺ جاری وا هەبوو لە خوێندنەوەی قورئانەکەی دەنگی بەرز دەکردەوە ، جاری واش هەبوو دەنگی نزم دەکردەوە [٢٤٠] ، جاری وا هەبوو خوێندنەوەکەی کورت دەکردەوە جاری واش هەبوو درێژی دەکردەوە ، جاری واش هەبوو زۆر درێژی دەکردەوە ، بەشێوەیەك هەروەکو ( عبدالله ) ـی کوڕی ( مسعود ) ﷺ دەفەرموێت : " شەوێکیان لە گەڵ پەیامبەری خوا ﷺ نوێژم کرد ئەوەندە بەپێوە ڕاوەستا تاکو نیازی خراپم بۆ دروست بوو ، پێیان فەرموو : نیازە خراپەکەت چی بوو ؟ فەرمووی : ویستم دابنیشم و پەیامبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە بەجێ بهێڵم " [٢٤١] .

وە ( حذيفة ) ـی کوڕی ( اليمان ) یش ﷺ فەرموویەتی : " شەوێکیان لە گەڵ پەیامبەری خوا ﷺ نوێژم کرد ، دەستی کرد بە خوێندنەوەی سورەتی : ﴿ البقرة ﴾ ، منیش وتم : لەسەری سەد ئایەت کڕنووش دەبات ، بەڵام هەر بەردەوام بوو ، جارێکی تر

---

[٢٣٩] البخاري ومسلم والنسائي ، وهو مخرج في " الارواء " .

[٢٤٠] النسائي بسند صحيح .

[٢٤١] البخاري ومسلم .

ووتم : بە دوو ڕکات تەواوی دەکات ، کەچی هەر بەردەوام بوو ، ووتم کۆتایی پێ ئەهێنێت و کڕنووش دەبات ، پاشان سورەتی : ﴿ النساء ﴾ ـی دەست پێ‌کرد تا کۆتایی پێ‌هێنا ، پاشان سورەتی : ﴿ آل عمران ﴾ دەست پێ‌کرد [٢٤٢] ، و کۆتایی پێ‌هێنا ، خوێندنەوەکەشی لەسەر خۆ بوو ، هەر کە دەگەشتە ئایەتێك تەسبیحاتی تێدا بوایە : ( سبحان الله ) ـی دەکرد ، وە کە دەگەشتە ئایەتێك شوێنی پەناگرتن بوایە بەخوای پەروەردگار ، پەنای پێ دەگرت ، پاشان کڕنووشی برد ... " هتد فەرموودەکە [٢٤٣] .

وە " شەوێکیان بە نەخۆشیەوە حەوت سورەتە درێژەکەی خوێندەوە " [٢٤٤] .

وە " جاری واش هەبوو لەهەر ڕکاتێکدا سورەتێك لەو سورەتانەی دەخوێندەوە " [٢٤٥] .

وە " هەرگیز لێیەوە نەزانراوە کە هەموو قورئانی پیرۆزی لە شەوێکدا خوێندبێتەوە " [٢٤٦] ، بەڵکو ئەوەی پێ‌باش نەبوو بۆ ( عبدالله ) ـی کوڕی ( عمرو ) رضي الله عنهما کە پێی فەرمووی : " اقرأ القرآن في كل شهر " ، هەموو قورئان لە مانگێکدا بخوێنە ، فەرمووی : لەوە زیاترم لە توانادایە ، پێی فەرمووی : " فاقرأهُ في عشرين ليلة " ، باشە لە بیست شەودا بیخوێنەوە ، دیسانەوە فەرمووی : لەوە زیاتر لە توانامدایە ، ئەم جارەیان پێی فەرمووی : " فاقرأهُ في سبع ولا تزد على ذلك " [٢٤٧] ، لە هەفتەیەکدا بیخوێنەوە و لەسەر ئەمەشەوە زیادی مەکە .

---

[٢٤٢] هكذا في الرواية بتقديم [ النساء ] على [ آل عمران ] ، وهو دليل على جواز ترك مراعاة ترتيب المصحف العثماني في القراءة ، ومضى مثله .

[٢٤٣] مسلم والنسائي .

[٢٤٤] أبو يعلى الحاكم وصححه ووافقه الذهبي ، وفي رواية " الطُوَل " : قال ابن الأثير : " بالضم جمع الطولى مثل الكبرى والكبر ، واسبع الطوال هي [ البقرة ] و [ آل عمران ] و [ النساء ] و [ المائدة ] و [الأنعام ] و [ الأعراف ] و [ التوبة] " .

[٢٤٥] أبو داود والنسائي بسند صحيح .

[٢٤٦] مسلم وأبو داود .

[٢٤٧] البخاري ومسلم .

پاشان " ڕێی پێدا لە پێنج شەودا بیخوێنێتەوە " [٢٤٨] .

پاشان " ڕێی پێدا لە سێ شەودا بیخوێنێتەوە " [٢٤٩] .

وە لێشی قەدەغە کرد لەوە کەمتر بیخوێنێتەوە [٢٥٠] ، وە هۆکارەکەشی بەوە هێنایەوە ، کە : " من قرأ القرآن في أقل من ثلاث لم يفقهه " [٢٥١] ، واتە : هەر کەسێك لە سێ ڕۆژ کەمتر قورئان بخوێنێتەوە ، لێی تێناگات .

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە پەیامبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " لا يفقه من قرأ القرآن في أقل من ثلاث " [٢٥٢] ، واتە : ئەو کەسەی کە لەسێ ڕۆژ کەمتر قورئان بخوێنێتەوە لێی تێناگات ، پاشان لە ووتەیەکی تریدا هاتووە کە فەرموویەتی : " فإنَّ لكل عابد شرة [٢٥٣] ولكل شرة فترة فإما إلى سنة وإما إلى بدعة فمن كانت إلى سنة فقد اهتدى ومن كانت فترته إلى غير ذلك فقد هلك " [٢٥٤] ، واتە : هەموو پەرستشکارێك گەرم وگوڕی و حەماسەتێکی تێدایە ، هەموو توندی و حەماسەتێکیش ساردبوونەوەیەکی

---

[٢٤٨] النسائي الترمذي وصححه .

[٢٤٩] البخاري وأحمد .

[٢٥٠] الدارمي وسعيد بن منصور في " سننه " بإسناد صحيح .

[٢٥١] أحمد بسند صحيح .

[٢٥٢] الدارمي والترمذي وصححه .

[٢٥٣] بكسر الشين المعجمة وتشديد الراء ؛ واتە : هیممەت و گەرم و گوڕی ، و ( شرة الشباب ) : سەرەتا و توند و تیژیەتی . پێشەوا ( الطحاوي ) فەرموویەتی : " هي الحدة في الأمور التي يريدها المسلمون من أنفسهم في أعمالهم التي يتقربون بها إلى ربهم عز وجل ، وإن رسول الله ﷺ أحب منهم فيها ما دون الحدة التي لابد لهم من القصر عنها والخروج منها إلى غيرها ، وأمر بالتمسك من الأعمال الصالحة بما قد يجوز دوامهم عليه ولزومهم إياه ؛ حتى يلقوا ربهم عزو جل ، و روي عنه ﷺ في كشف ذلك المعنى أنه قال : ( أحب الأعمال إلى الله أدومها وإن قل ) " .

دەڵێم : ئەم فەرموودەیەی کە هێناویەتیەوە و ووشەی ( رُوِيَ ) یەی لە پێشدا هێناوەتەوە ، فەرموودەیەکی ( صحیح ) ـەو ، ( متفق عليه ) یە ، دایکە ( عائشة ) ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ دەیگێڕێتەوە .

[٢٥٤] أحمد وابن حبان في " صحيحه " .

هەیە ، ئەو سارد بوونەوەیەش یان لە سنوری سوننەتدا دەوەستی ، یان لە سنوری بیدعەدا دەوەستی : ئەو کەسەی کە ساردبوونەوەکەی لە سنوری سوننەتدا بێ ئەوا هیدایەت دراوە ، ئەوەش کە سارد بوونەوەکەی لە سنوری غەیری سوننەت بێت ئەوا بە تیاچووە .

بۆیە " پەیامبەری خوا ﷺ لە سێ ڕۆژ کەمتر قورئانی نەدەخوێندەوە" [٢٥٥] .

وە دەیفەرموو : " من صلى في ليلة بمائتي آية ؛ فإنه يكتب من القانتين المخلصين " [٢٥٦] ، واتە : هەر کەسێك بتوانێت لە شەوێك دا دووسەد ئایەت بخوێنێت لە شەونوێژەکەیدا ، ئەوا لە ( القانتين المخلصين ) دادەنرێت .

وە " هەموو شەوێك سورەتی : [ بني إسرائيل ] ( ١٧ : ١١١ ) ، و سورەتی : [ الزمر ] ـی ( ٣٩ : ٧٥ ) دەخوێندەوە [٢٥٧] .

وە دەیفەرموو : " من صلى في ليلة بمائة آية لم يكتب من الغافلين " [٢٥٨] ، واتە : هەرکەسێك بتوانێت لە شەوێك دا سەد ئایەت لە شەو نوێژەکەیدا بخوێنێتەوە ، ئەوا لە بێ ئاگایان ناژمێردرێت .

وە " جاری واش هەبوو نزیکەی پەنجا ئایەتی یان زیاتری دەخوێندەوە " [٢٥٩] .

وەجاری واش هەبوو " هاوشێوە و نزیکەی سورەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ ﴾ ـی ( ٧٣ : ٢٠ ) دەخوێندەوە " [٢٦٠] .

وە " پەیامبەری خوا ﷺ بە درێژی شەوگار شەونوێژی نەدەکرد " [٢٦١] زۆر بە دەگمەن نەبێت .

---

[٢٥٥] ابن سعد ( ١ / ٣٧٦ ) وأبو الشيخ في ( أخلاق النبي ﷺ : ٢٨١ ) .

[٢٥٦] الدارمي والحاكم وصححه ، ووافقه الذهبي .

[٢٥٧] أحمد وابن نصر بسند صحيح .

[٢٥٨] الدارمي والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

[٢٥٩] البخاري وأبو داود .

[٢٦٠] أحمد وأبو داود بسند صحيح .

[٢٦١] مسلم وأبو داود .

( عبدالله ) ـى كوڕى ( خباب ) ـى كـوڕى ( الأرت ) ﷺ ـ كـه يه‌كێكـه لـه‌و هاوه‌ڵانه‌ى له گه‌ڵ په‌يامبه‌رى خوادا ﷺ ئاماده‌ى جه‌نگى به‌در بووه له په‌يامبه‌رى خواوه ﷺ بۆمان ده‌گێڕێته‌وه و ده‌فه‌رموويت : شه‌وێك به درێـژى چـاودێرى په‌يامبـه‌رى خـوام ده‌كرد ﷺ ( له ڕيوايه‌تێكى تردا هاتووه : به‌درێژى شه‌وێك كه تێيدا شه‌ونوێژى ده‌كرد ) تاكو ئه‌وكاته‌ى كه گزنگى به‌ربه‌يان ده‌ركه‌وت ، و سه‌لامى نوێژه‌كه‌ى دايـه‌وه ، خـه‌بباب فه‌رمووى : له جێگه‌ى دايك و باوكم بيت ( يان : دايك و باوكم به‌قوربانت بێـت ) ئـه‌ى په‌يامبه‌رى خوا ﷺ ئه‌م شه‌و نوێـژێكت ئه‌نجامـدا هـه‌رگيز نـه‌مبينيويت بـه‌و شـێوه‌يه ئه‌نجامى بده‌ى ـ واته : له درێژكردنه‌وه‌يدا ـ ، ئه‌ويش فه‌رمووى : " أجل إنها صلاة رغب ورهب [ وإني ] سألت ربـي عز وجل ثلاث خصال فأعطاني اثنتين ومنعني واحـدة : سألت ربي أن لا يهلكنا بما أهلك به الأمم قبلنا ( وفي لفظ : أن لا يهلك أمتي بـسنة ) فأعطانيها ، وسألت ربي عز وجل أن لا يظهر علينا عدوا من غيرنا فأعطانيها ، وسـألت ربي أن لا يلبسنا شيعاً فمنعنيها " [٢٦٢] .

وه جارێكيان به درێژايى شه‌ونوێژه‌كه‌ى ئايه‌تێكى دووباره ده‌كرده‌وه تا ڕۆژى لێبووه‌وه ، ئه‌ويش ئه‌و ئايه‌ته بوو كه خواى پـه‌روه‌ردگار تێيـدا ئه‌فـه‌رموێت : ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ

---

ده‌ڵێم : له به‌ر ئه‌م فه‌رمووده‌يه و فه‌رمووده‌ى تريش ئه‌وه‌مان بۆ ئاشكرا ده‌بێت كه مه‌كروهه به بـه‌رده‌وامى ، يـان زۆربه‌ى جار هه‌موو شه‌و به‌درێژى زيندووبكريته‌وه ، له‌به‌رئه‌وه‌ى پێـچه‌وانه‌ى سـوننه‌تى په‌يامبـه‌رى خوايـه ﷺ ، چونكه ئه‌گه‌ر زيندووكردنه‌وه‌ى هه‌موو شه‌و به‌درێژى چاكتر بوايه ، ئه‌وا په‌يامبـه‌رى خـوا ﷺ لـه ده‌سـتى خـۆى نه‌ده‌دا ، باشترين ڕێبازيش ڕێبـازى ( محمد ) ـه ﷺ ، به‌وه‌ش هـه‌ڵنه‌خـه‌ڵـه‌تێيت كه له پێـشه‌وا ( أبو حنيفة ) ـه‌وه ـ به ڕه‌حمه‌ت بێت ـ ده‌يگێڕنه‌وه كه گوايا چل ساڵ ماوه‌ته‌وه نوێژى بـه‌يانى بـه ده‌سـتنوێژى عيـشا ده‌كـرد ، چونكه ئه‌م ڕيوايه‌ته كه لێيه‌وه ده‌گێڕنه‌وه هيچ بنه‌وايه‌كى نيه ، به‌ڵكو ( العلامة الفيروز أبادي ) لـه ( الرد على المعترض : ٤٤ / ١ ) فه‌رموويه‌تى : " هذا من جملة الأكاذيب الواضحة التي لا يليق نسبتها إلى الإمام ، فمـا في هذا فضيلة تُذكَر ، وكان الأولى بمثل هذا الإمام أن يأتي بالأفضل ، ولا شك أن تجديد الطهارة لكل صلاة أفـضل وأتم وأكمل ، هذا إن صح أنه سهر طوال الليل أربعين سنة متوالية ! وهذا أمر بالمحال أشبه ، وهو من خرافـات بعض المتعصبين الجهال ، قالوه في أبي حنيفة وغيره ، وكل ذلك مكذوب " .

[٢٦٢] النسائي وأحمد والطبراني ( ١ / ١٨٧ / ٢ ) وصححه الترمذي .

عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ ( ٥ : ١١٨ ) ، واتە : ئەگەر سزایان بدەیت ئەوا بەندەی خۆتن ، ئەگەر لێشیان خۆشبیت ، ئەوا خاوەنی تەواوی توانایی و دەسەڵات و دانایی هەر خۆتی .

کڕنووش و سوژدە و پاڕانەوەکانی هەموو هەر بەم ئایەتە بوو ، کە ڕۆژ بووەوە ( أبو ذر ) ﷺ فەرمووی : ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ئەم شەو بەردەوام هەر ئەم ئایەتەت خوێندەوە تاکو ڕۆژت کردەوە کڕنووش وسوژدە و پاڕانەوەکانت هەر هەموو بەم ئایەتە بوو ، لە کاتێکدا خوای پەروەردگار هەموو قورئانی پێ فێرکردوویت ، ئەگەر یەکێك لە ئێمە بیکردایە بەرامبەری شتمان لە دڵدا دروست دەبوو ؟ پەیامبەری خواش ﷺ فەرمووی : " إني سألت ربي – عزوجل – الشفاعة لأمتي ، فأعطانيها ، وهي نائلة – إن شاء الله – لمن لا يشرك بالله شيئاً "[٢٦٣] ، واتە : من داوای شەفاعەتم بۆ ئوممەتەکەم کرد لە پەروەردگارم ، ئەویش پێی بەخشیم ، ئەو کەسانەش بەری دەکەون کە خوای پەروەردگار بە تاك و تەنها بپەرستن ، و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەن .

وە " پیاوێك پێی فەرموو : ئەی پەیامبەری خوا ﷺ دراوسێیەکم هەیە شەو نوێژ دەکات ، و تەنها سورەتی : ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ ( ١١٢ : ٤ ) دەخوێنێتەوە ( هەر دووبارەی دەکاتەوە ) ( لەوەش زیاتر هیچ سورەتێکی تری قورئانی پیرۆز ناخوێنێتەوە ) ، وەکو ئەوەی بەکەمی بزانێت ، پەیامبەری خواش ﷺ پێی فەرموو : " والذي نفسي بيده إنها لتعدل ثلث القرآن "[٢٦٤] ، واتە : سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بەدەستە ، ئەو سورەتە بەرامبەر بە سێ یەکی قورئانی پیرۆزە .

---

[٢٦٣] النسائي وابن خزيمة ( ١ / ٧٠ / ١ ) وأحمد وابن نصر و الحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

[٢٦٤] أحمد و البخاري .

**٧ ـ نوێژی وەتر :**

پەیامبەری خوا ﷺ لە ڕکاتی یەکەمدا سورەتی : ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾ ( ٨٧ : ١٩ ) ، و لە ڕکاتی دووەمـدا سـورەتی : ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴾ ( ١٠٩ : ٦ ) ، و لـە ڕکاتی سێیەمیشدا سورەتی : ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ ـی ( ١١٢ : ٤ ) دەخوێندەوە [٢٦٥] .

وە هەندێك جار سورەتی : ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴾ ( ١١٣ : ٥ ) ، و سـورەتی : ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ ( ١١٤ : ٦ ) یشی بۆ زیاد دەکرد [٢٦٦] .

وە جارێکیان سەد ئایەتی لە سورەتی : ﴿ النساء ﴾ ـــی ( ٤ : ١٧٦ ) لـە ڕکاتـە تاکەکەی وەتردا خوێندەوە [٢٦٧] .

بەڵام سەبارەت بەو دوو ڕکاتەی دوای نوێژی وەتر[٢٦٨] ، پەیامبەری خوا ﷺ دوو سورەتی : ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ﴾ ( ٨ : ٩٩ ) ، و ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴾ ـی تێدا دەخوێندنەوە [٢٦٩] .

**٨ ـ نوێژی جومعە :**

وە " پەیامبەری خوا ﷺ ـ هەندێك جار ـ لە ڕکاتی یەکەمدا سورەتی : ﴿ الجمعة ﴾ ( ١١ : ٦٢ ) ـی دەخوێندەوە ، و لە ڕکاتەکەی تریدا سورەتی : ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ﴾ ( ١١ : ٦٣ ) [٢٧٠] ، وجاری واش هەبوو لە جیاتی سورەتی : ﴿ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ ـەی ( ٢٦ : ٨٨ ) دەخوێندەوە [٢٧١] .

---

(٢٦٥) النسائي والحاكم وصححه .

(٢٦٦) الترمذي وأبو العباس الأصم في ( حديثه : ج ٢ رقم ١١٧ ) وصححه الحاكم ووافقه الذهبي .

(٢٦٧) النسائي وأحمد بسند صحيح .

(٢٦٨) ثبتت هاتان الركعتان في " صحيح مسلم " وغيره ، وهما تنافيان قوله ﷺ : " اجعلوا آخر صـلاتكم بالليل وترا " رواه البخاري ومسلم ، وقد اختلف العلماء في التوفيق بين الحديثين على وجوه لم يترجح عندي شيء منها ، والأحوط تركها اتباعاً للأمر . والله أعلم .

ثم وقفت على حديث صحيح يأمر بالركعتين بعد الوتر ؛ فالتقى الأمر بالفعل ، وثبت مشروعية الركعتين للناس جميعا ، والأمر الأول يحمل على الاستحباب فلا منافاة وقد خرجته في ( الصحيحة :١٩٩٣ ) . والحمد لله على توفيقه .

(٢٦٩) أحمد وابن نصر والطحاوي ( ١ / ٢٠٢ ) وابن خزيمة وابن حبان بسند حسن صحيح .

وە هەندێك جار " لە ڕکاتی یەکەمدا سورەتی : ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴾ ( ٨٧ : ١٩ ) ، و لە ڕکاتی دووەمدا سورەتی : ﴿ هَلْ أَتَاكَ ﴾ ـی دەخوێندەوە [٢٧٢] .

**٩ ـ نوێژی دوو جەژنەکە :**

وە " پەیامبەری خوا ﷺ ـ هەندێك جار ـ لە ڕکاتی یەکەمدا سورەتی : ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴾ و لە ڕکاتەکەی تریدا سورەتی : ﴿ هَلْ أَتَاكَ ﴾ ـی دەخوێندەوە [٢٧٣] ، وە هەندێك جار تیایاندا " سورەتی : ﴿ قٓ وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ ﴾ ( ٥٠ : ٤٥ ) ، و سورەتی : ﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ ﴾ ( ٥٤ : ٥٥ ) ـی دەخوێندەوە " [٢٧٤] .

**١٠ ـ نوێژی جەنازە :**

" سوننەت لە نوێژی جەنازەدا ئەوەیە کە سورەتی : [ فاتحـة الكتـاب ] [٢٧٥] [ و سورەتێکی تری ] [٢٧٦] تێدا بخوێنرێتەوە " ، " بە دەنگی نـزم دەیخوێندنـەوە، ئـەوەش دوای تەکبیرەی ئیحرام ( کە تەکبیرەی یەکەمە ) " [٢٧٧] .

---

[٢٧٠] مسلم وأبو داود ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٤٥ ) .

[٢٧١] مسلم وأبو داود ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٤٥ ) .

[٢٧٢] مسلم وأبو داود .

[٢٧٣] مسلم وأبو داود .

[٢٧٤] مسلم وأبو داود .

[٢٧٥] ئەمەش وتەی پێشەوا شافعی و أحمد و إسحاق ، و هەندێك لە پاشینە لێکۆڵەرەوەکانی مەزهەبی ( أبو حنيفة ) یە ، ئەم بۆچوونەیان وەرگرتووە ، بەڵام خوێندنەوەی سورەتێك پاش سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ بۆچوونێکە لە بۆچوونەکانی شافعی مەزهەبەکان ، بۆچوونەکەش بۆچوونێکی ڕەوایە .

[٢٧٦] البخاري وأبو داود والنسائي ، وابن الجارود ، وليست الزيادة شاذة كما زعم التويجري ، انظر المقدمة .

[٢٧٧] النسائي والطحاوي بسند صحيح .

## جوان خوێندنەوەی قورئان لە کاتی نوێژ ، و دەنگ خۆش کردنەوە تێیدا

" پەیامبەری خوا ﷺ قورئانی بە جوانی دەخوێندەوە ـ هەروەکو خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردبوو ـ لە کاتی خوێندنیدا نە دەیلەراندەوە و نەش پەلەی لێ دەکرد ، بەڵکو خوێندنەوەکەی بە شێوەیەك بوو " پیت پیتی تێدا دەردەخست ، و مافی خۆی دەدانێ " [٢٧٨] ، بە شێوەیەك " سورەتی وای بەجوانی دەخوێندەوە درێژتر دەبوەوە لە سورەتێکی لە خۆی درێژ تر " [٢٧٩] .

وە دەیفەرموو : " يقال لصاحب القرآن : اقرأ وارتق ورتل كما كنت ترتل في الدنيا فإن منـزلك عند آخر آية تقرؤها " [٢٨٠] ، واتە : بە قورئان خوێن دەوترێت : بە جوانی بخوێنەوەو بەرزبەروە ، هەروەکو چۆن لە دونیادا بەجوانی دەتخوێندەوە ، پلەو مەنزڵگات ـ لە بەهەشت دا ـ بە پێی دوا ئایەتە کە دەیخوێنیتەوە .

وە " لە پیتەکانی درێژ کردنەوەدا ( واتە : حروف المد ) خوێندنەوەکەی درێژ دەکردەوە ، بۆ نموونەوە : [ بسم الله ] ـی درێژ دەکردەوە و [ الرحمن ] ـی درێژ دەکردەوە و [ الرحيم ] ی درێژ دەکردەوە [٢٨١] [ النضيد ] [٢٨٢] ، و هاو شێوەکانیشی بە هەمان شێوە درێژ دەکردەوە .

وە پەیامبەری خوا ﷺ لە کۆتایی هەموو ئایەتێکدا دەوەستا هەروەکو لە پێشدا باسکرا [٢٨٣] .

---

[٢٧٨] ابن المبارك في ( الزهد : ١ / ١٦٢ ) من ( الكوكب المنير : ٥٧٥ ) ، وأبو داود وأحمد بسند صحيح .

[٢٧٩] مسلم ومالك .

[٢٨٠] أبو داود والترمذي وصححه .

[٢٨١] البخاري وأبو داود .

[٢٨٢] البخاري في " خلق أفعال العباد " بسند صحيح .

[٢٨٣] لە باسی خوێندنەوەی سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ ـدا .

وە " ـ جاری واش هەبوو ـ ئەو دەنگەی کە لە قوڕگ دا دەردەچوو دووبارەی دەکردەوە ( الترجیع ) [٢٨٤] ، هەروەکو لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا ئەنجامی دا ، لەو کاتەی بەسەر ووشترەکەیەوە بوو ، سورەتی ﴿ الفتح ﴾ ـی ( ٢٩ : ٤٨ ) دەخوێندەوە [ خوێندنەوەیەکی هێمن و لەسەرخۆی هەبوو ] [٢٨٥] ، ( عبدالله ) ـی کوڕی ( مغفل ) ﷺ بەم شێوەیە دووبارە کردنەوەی پیتەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە ( آ آ آ ) [٢٨٦] .

وە فەرمانیشی بە خۆشکردنەوەی دەنگ دەکرد لە کاتی قورئان خوێندندا ، و دەیفەرموو : " زینوا القرآن بأصواتكم فإن الصوت الحسن یزید القرآن حسناً " [٢٨٧] ، واتە : قورئان بڕازێننەوە بە دەنگەکانتان ، چونکە دەنگی خۆش قورئان زیاتر دەڕازێنێتەوە .

وە دەیفەرموو : " إن من أحسن الناس صوتاً بالقرآن الذي إذا سمعتموه یقرأ حسبتموه یخشى الله " [٢٨٨] ، واتە : خۆشترین دەنگ دەنگی کەسێکە : کە گوێتان لە دەنگی دەبێ لە کاتی قورئان خوێندندا وا بزانن لە خوا دەترسێ .

---

[٢٨٤] من الترجیع ؛ قال الحافظ : " هو تقارب ضروب الحرکات في القراءة ، وأصله : الترديد ، وترجیع الصوت : ترديده بالحلق ، وقال المناوي : " وذلك ینشأ غالباً عن أریحیة وانبساط والمصطفى ﷺ حصل له من ذلك حظ وافر یوم الفتح " .

[٢٨٥] البخاري ومسلم .

[٢٨٦] پێشەوا ( الحافظ ) لە واژەکردنی واتای ( آ آ آ ) ـدا فەرموویەتی : " همزة مفتوحة بعدها ألف ساكنة ثم همزة أخرى " ، ونقل الشیخ علي القاري مثله عن غیر الحافظ ، ثم قال : " والأظهر أنها ثلاث ألفات ممدودات " .

[٢٨٧] البخاري تعلیقا ، وأبو داود والدارمي والحاکم وتمام الرازي بسندین صحیحین .

**تنبیه** ؛ انقلب الحدیث الأول على بعض الرواة ؛ فرواه بلفظ : " زینو أصوتکم بالقرآن " وهو خطأ بین روایة ودرایة ، ومن صححه فهو أغرق في الخطأ ؛ لمخالفته للروایات الصحیحة المفسرة في الباب ، بل هو مثال صالح للحدیث المقلوب ، وبیان هذا الإجمال في ( الأحادیث الضعیفة : ٥٣٢٨ ) .

[٢٨٨] حدیث صحیح ، رواه ابن المبارك في ( الزهد : ١ / ١٦٢ ) من ( الکوکب المنیر : ٥٧٥ ) ، و الدارمي وابن نصر والطبراني وأبو نعیم في " أخبار أصبهان " والضیاء في " المختارة " .

وە فەرمانیشی دەکرد بە خۆشکردنەوەی دەنــگ لـە کـاتی قورئـان خوێندنــەوەدا ، و دەیفــەرمــوو : " تعلموا كتاب الله ، وتعاهدوه ، واقتنوه ، وتغنوا به ، فوالذي نفسي بيده لهو أشد من المخاض في العقل " [٢٨٩] ، واتە : فێـری کتێبەکـەی پـەروەردگارتان بــن ، زۆریــش بیخوێننــەوە ، و بایەخــشی پــێ بــدەن ، و لــە کــاتی خوێندنەوەیــدا دەنگتــان خۆشبکەنەوە ، چونکە سوێند بێ بەو زاتەی کە گیانی منی بەدەستە ، لە ووشتری ئاووس توندتر لە دەست دەردەچێت کە بە پەت بەسترابێتەوە .

وە دەیفەرموو : " ليس منا من لــم يتغن بالقرآن " [٢٩٠] ، واتە : لە ئێمــە نیــیە ئەو کەسەی کە هەوڵی دەنگ خۆشکردنی نەدات لە کاتی قورئان خوێندنیدا .

وە دەیفەرموو : " ( ما أذِن [٢٩١] الله لشيء ما أذِنَ ( وفي لفظ : كأذنه ) لنبي [ حسن الصوت ( وفي لفظ : حسن الترنم ) ] يتغنــى بالقرآن [ يجهر بــه ] " [٢٩٢] ، واتــە : خوای پەروەردگار بیستنی دەنگی هیچ شتێکی لە لا باش نەبووە ، وەکو بیــستنی دەنگــی پەیامبەرێکی [ دەنگ خۆش ( لە گۆ ( لفظ ) ێکی تردا هاتووە : صەدا خۆش ) ] ـی لا باش بووە ، دەنگی خۆشبکاتەوە و [ دەنگی بەرز بکاتەوە لە خوێندنەوەکەی ] .

---

[٢٨٩] الدارمي وأحمد بسند صحيح . ( المخاض ) : واتە : ووشتر ، وە (العقل ) كۆی ( عِقال ) ـــە : ئــەوەش ئەو گورزیــەیە کە قاچی ووشتری پێ دەبەسترێتەوە .

[٢٩٠] أبو داود وصححه الحاكم ووافقه الذهبي .

**تنبيـه** : ... إلــخ ، [ تەوارکــەری ئــەم پــەراوێزەمان نەنووســیوە لــە بــەر درێــژی پەراوێزەکــە ، وە هــیچ پەیوەندیەکیشی بەم بابەتەوە نیە ، بەڵکو وەڵام دانەوەیە بۆ هەندێك لە ڕەخنە گران !!! ] وەرگێڕ .

[٢٩١] قال المنذري : " بكسر الذال ؛ أي : ما استمع الله لشيء من كلام الناس ؛ كما استمع إلى من تغنى بالقرآن ؛ أي : يُحَسِّنُ به صوته ، وذهب سفيان بن عيينة وغيره إلى أنه من الإستغناء ، وهو مردود " .

[٢٩٢] البخاري ومسلم ، والطحاوي وابن منده في ( التوحيد : ١ / ٨١ ) .

وە بە ( أبو موسى الأشعري ) ﷺ فەرموو : " لو رأيتني وأنا أستمع لقراءتك البارحة لقد أوتيت مزماراً [٢٩٣] من مزامير آل داود " فقال أبو موسى:لو علمت مكانك لحبرت لك [٢٩٤] ـ يريد تحسين الصوت ـ تحبيراً " [٢٩٥] ، واتە : ئەگەر دەمتبینی ، ئێوارەی ئەو کاتەی کە گوێم لە خوێندنەوەکەت دەگرت ، بە ڕاستی : بەشێك لە دەنگ خۆشیەکەی بنەماڵەی داودت پێ بەخشراوە ، ئەویش فەرمووی : ئەگەر دەمزانی گویم لێ دەگریت دەنگم خۆشتر دەکردەوە .

## ڕاست کردنەوەی هەڵەکانی پێشنوێژ لە قورئان خوێندنیدا

وە پەیامبەری خوا ﷺ ئەوەشی کردووە بە سوننەت ، کە ئەگەر پێشنوێژ لە قورئان خوێندنیدا تووشی هەڵە بوو بۆی ڕاست بکرێتەوە ، بۆیە دەبینین جارێکیان " پەیامبەری خوا ﷺ نوێژێکی ئەنجام دا و تێیدا قورئانی خوێندەوە و خوێندنەوەکەی لێ تێکەڵ بوو ، کە سەلامی دایەوە بە ( أُبَـي ) ﷺ " ی فەرموو : " أصليت معنا ؟ " واتە : نوێژت لە گەڵ ئێمەدا کرد ؟ فەرمووی : بەڵێ ، ئەویش فەرمووی : " فما منعك [ أن تفتح علي ] ؟ " [٢٩٦] ، واتە : ئەی چی ڕێگربوو لەوەی کە بۆم ڕاست بکەیتەوە ؟

---

[٢٩٣] زانایان فەرموویانە : مەبەست بە ( مزمار ) لێرەدا : دەنگی خۆشە ، وە بنەوای ( الزمر ) : گۆرانیە ، وە ( آل داود ) خودی پەیامبەر داودە ـ عليه السلام ـ ، وە ( آل ) ـی فلان بەخۆیشی دەوترێت ، وە پەیامبەر داودە ـ عليه السلام ـ زۆر دەنگ خۆش بووە . پێشەوا ( النووي ) لە " شرح مسلم " ـدا ئەمەی گێڕاوەتەوە .

[٢٩٤] مەبەستی : دەنگ خۆشکردنەوە ، و غەمگین کردنی .

[٢٩٥] عبد الرزاق في ( الأمالي : ٢ / ٤٤ / ١ ) ، والبخاري ومسلم وابن نصر والحاكم .

[٢٩٦] أبو داود وابن حبان والطبراني وابن عساكر (٢/٢٩٦/٢) والضياء في " المختارة " بسند صحيح .

## پەناگرتن بە خوا ( الإستعاذة ) ، و تفكردن لەنوێژدا بۆ لەخۆ دوورخستنەوەی وەسوەسە

وە ( عثمان ) ی کوڕی ( أبي العاص ) ﷺ پێی فەرموو : ئەی پەیامبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەمدا شەیتان بوو بە ڕێگر لە نێوان من و خوێندنەوەکـەم : خوێندنەوەکـەی لێ تێك دەدام ؟ پەیامبەری خواش ﷺ پێی فـەرموو : " ذاك شيطان يقال له : خِنْزِب فإذا أحسسته فتعوذ بالله منه واتفل[٢٩٧] على يسارك ثلاثا " قال ففعلت ذلك فأذهبــه الله عنـــي [٢٩٨] ، واتە : ئەوە شەیتانێکە پێی دەوترێت : ( خِنـــزِب ) جا ئەگەر جـارێکی تر هەستت پێکرد ، ئەوا پەنا بگرە بە خوای پەروەردگار لەو شەیتانە و سێ جاریش تــف بکە بە لای چەپتدا . دەفەرموویت : ئەوەی کە پەیامبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم ئەنجامم دا ، خوای پەروەردگاریش شەیتانی لــێ دوورخستمەوە .

---

[٢٩٧] لە ( التفل ) ـەوە وەرگیراوە ، بریتیشە : لە تفێك کە کەمترین تەڕی لە گەڵدا بێت ، واتە : لە فووکردن زیاترە .

[٢٩٨] مـسلم وأحمد . وە پێـشەوا ( النووي ) فەرموویـەتی : " لـەم فەرموودەیـەدا ئـەرمان بـۆ دەردەکـەوێت کـە سوننەتە پەنا بگریت بە خوای پەروەردگار لەشەیتان لەکاتی وەسوەسەکردنی بۆت ، لەگەڵ تفکردن بەلای چەپدا " .

## کڕنووش

پاش ئەوەی کە پەیامبەری خوا ﷺ لە خوێندنەوە دەبووەوە ، ماوەیەکی کەم بێدەنگ دەبوو ( سکت سکتة ) [٢٩٩] ، پاشان هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە [٣٠٠] ـ بەو شێوەیەی کە لە پێشدا باسکرا ( لە تەکبیرەی دابەستنی نوێژدا ) ـ پاشان ( الله أكبر ) ـی دەکرد [٣٠١] ، و کڕنووشی دەبرد [٣٠٢] .

وە فەرمانیشی بەو پیاوە کردووە کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ( المسيء صلاته ) و پێی فەرمووە : " إنها لا تتم صلاة أحدكم حتى يسبغ الوضوء كما أمره الله ... ثم يكبر الله ويحمده ويمجده ويقرأ ما تيسر من القرآن مما علمه الله وأذن له فيه ثم يكبر ويركع [ و يضع يديه على ركبتيه ] حتى تطمئن مفاصله وتسترخي ... " الحديث [٣٠٣]

---

[٢٩٩] أبو داود الحاكم وصححه ووافقه الذهبي .
ئەم بێدەنگ بوونەش پێشەوا ( ابن القيم ) و جگە لەویش بە ئەوەندەیان داناوە کە هەناسەت بۆ بگەڕێتەوە .
[٣٠٠] البخاري ومسلم . ئەم دەست بەرزکردنەوەیەمان بە ( متواتر ) ی پێگەیشتووە لە پەیامبەری خواوە ﷺ ، هەروەها لەکاتی ڕاست بوونەوە لەکڕنووش ، ئەوەش مەزهەبی سێ پێشەواکە و جگە لەوانیشە لە زۆربەی فەرموودەناسان و فەقیهەکان ، وە ئەوەش ئەو کردارەیە کە پێشەوا مالك لە سەری مردووە ، هەروەکو ( ابن العساكر : ١٥ / ٧٨ / ٢ ) بزمانی گێڕاوەتەوە ، هەندێکیش لە حەنەفی مەزهەبەکان ئەوەیان هەڵبژاردووە لەوانەش ، ( عصام ) ـی کوڕی ( يوسف ) ـە ـ أبو عصمة البلخي ـ ( ٢١٠ ) کە قوتابی پێشەوا ( أبو يوسف ) ـە ـ بەڕەحمەت بێت ـ ، هەروەکو لە پێشەکی ئەم پەرتوکەدا ئاماژەمان پێکردووە ، وە ( عبدالله بن أحمد ) لە ( مسائله : ص ٦٠ ) لە باوکیەوە دەیگێڕێتەوە : " يرى عن عقبة بن عامر أنه قال في رفع اليدين في الصلاة : له بكل إشارة عشر حسنات " .
قلت : " ويشهد له الحديث القدسي ... ومن همَّ بحسنة فعملها كتبت له عشر حسنات إلى سبعمائة " رواه الشيخان . انظر : ( صحيح الترغيب : ١٦ ) .
[٣٠١] البخاري ومسلم .
[٣٠٢] البخاري ومسلم .
[٣٠٣] أبو داود والنسائي وصححه الحاكم ووافقه الذهبي .

، واته : نوێژی هیچ کەسێك لە ئێوە تەواو نیە تاکو دەستنوێژەکەی بە باشی بەو شێوەیە نەشوات کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردووە ... پاشان تەکبیرەی ئیحرام دابەستێت ، و شوکر و ستایشی خوای پەروەردگار بکات ، و ئەوەش لە توانایدا هەبوو قورئان بخوێنێت ، لەوەی کە خوای پەروەردگار فێری کردووە و ڕێی پێداوە تێیدا ، و پاشان [ الله أکبر ] بکات و کڕنووش ببات [ دوو دەستیشی لەسەر ئەژنۆکانی دابنێ ] ، تاکو هەموو جومگەکانی ئارام دەبن و خاو دەبنەوە .

## چۆنێتی کڕنووش بردن

وە " پەیامبەری خوا ﷺ لە کاتی کڕنووش بردنیدا ناو دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی دادەنان " [٣٠٤] .

وە " فەرمانیشی پێ دەکردن بەو کارە " [٣٠٥] هەروەها فەرمانیشی بەو پیاوە پێ کردووە کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ( المسيء صلاته ) ، هەروەکو لە پێشدا باسی لێ وەکرا .

وە " ناولەپی دەستەکانی لە ئەژنۆکانی جێگیر و توند دەکرد " [ هەروەکو بلێی ئەژنۆکانی گرتبێت ] [٣٠٦] .

وە " پەنجەکانی لە یەکتر جیادەکردەوە " [٣٠٧] ، وە فەرمانیشی بەئەنجامدانی ئەم کارە کردووە بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ( المسيء صلاته ) ، وە پێی فەرمووی : " إذا ركعت فضع راحتيك على ركبتيك ، ثم فرج بين أصابعك ، ثم امكث حتى يأخذ كل عضو مأخذه " [٣٠٨] ، واتە : ئەگەر کڕنووشت برد ناو

---

[٣٠٤] البخاري وأبو داود .

[٣٠٥] البخاري مسلم .

[٣٠٦] البخاري وأبو داود .

[٣٠٧] الحاكم وصححه ووافقه الذهبي ، والطيالسي ، وهو مخرج في ( صحيح أبي داود : ٨٠٩ ) .

[٣٠٨] ابن خزيمة وابن حبان في " صحيحيهما " .

لەپەکانت ( ناو دەستەکانت ) لەسەر ئەژنۆکانت دابنێ و پەنجەکانت لە یەکتر جیابکەرەوە ، پاشان لە کڕنووشەکەتدا بمێنەوە تاکو هەموو ئەندامێکت جێی خۆی دەگرێتەوە .

وە " ئانیشکەکانی لە لاکەلەکانی جیا و دوور دەکردەوە " (٣٠٩) .

وە " کاتێك کە کڕنووشی ببردایە پشتی پان و ڕێك و ڕاست دەکردەوە " (٣١٠) ، " بە شێوەیەك ئەگەر ئاووت بکردایە بە سەر پشتیدا ڕادەوەستا " (٣١١) ، وە بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا فەرموو : " فإذا رکعت فاجعل راحتیك علی رکبتیك ، وامدد ظهرك ، ومکن لرکوعك " (٣١٢) ، واتە : ئەگەر کڕنووشت برد ئەوا ناو لەپی دەستەکانت جێگیر بکە لە ئەژنۆکانت ، و پشتیشت پان و ڕێك و ڕاست بکە ، و خۆیشت جێگیر بکە .

وە " سەریشی نە نزمتر دەکردەوە لە ئاستی پشتی ، وە نە لە ئاستی پشتی بەرزتری دەکردەوە " (٣١٣) ، بەڵکو لەنێوانیاندا بوو (٣١٤) .

---

(٣٠٩) الترمذي وصححه ابن خزيمة .

(٣١٠) البيهقي بسند صحيح والبخاري .

(٣١١) الطبراني في " الكبير " و " الصغير " ، وعبد الله بن أحمد في " زوائد المسند " وابن ماجه .

(٣١٢) أحمد وأبو داود بسند صحيح .

(٣١٣) أبو داود والبخاري في " جزء القراءة " بسند صحيح ، ووشەی ( لا يقنع ) ؛ واتە : سەری بەرز نەدەکردەوە بە شێوەیەك لە ئاستی پشتی بەرزتر بێت . ( نهاية ) .

(٣١٤) مسلم وأبو عوانة .

## واجبێتی ئارامگرتن
## ( الطمأنينة ) ـی ئەندامەکانی جەستە لە کڕنووشدا

وە " پەیامبەری خوا ﷺ لە کڕنووشەکانیدا ئـارامی دەگـرت " ، وە فەرمانیـشی کردووە بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا بە ئەنجامدانی ئەم کارە ، هەروەکو لە بەشی پێشوودا باسی لێوە کرا .

وە دەیفەرموو : " أتموا الركوع والسجود ؛ فوالذي نفسي بيده ؛ إني لأراكم مـــن بعد [٣١٥] ظهري إذا ما ركعتم ، وما سجدتم " [٣١٦] ، واتە : کڕنووش و سـوژدەکانتان بە تەواوی بەرن ، سوێند بێت بەو زاتەی کە گیانی منـی بەدەسـتە ، لـە پـشتی سـەروە ئەتانبینم کە کڕنووش دەبەن یان سوژدە دەبەن هەروەکوچۆن لە پێشەوە دەتان بینم .

وە " پیاوێکی بینی لە نوێژەکەیدا کڕنووش و سوژدەکانی بە تەواوی نەدەبرد ، وەکو ئەوەی لە کاتی سوژدە بردنیدا دنووك لە زەوی بدات ، فەرمووی : " لو مات هذا علـــى حاله هذه ؛ مات على غير ملة محمد ؛ [ ينقر صلاته كما ينقر الغراب الدم ] مثل الذي لا يتم ركوعه وينقر في سجوده ؛ مثل الجائع الذي يأكل التمرة والتمرتين لا يغنيان عنه شيئا " [٣١٧] ، واتە : ئەگەر ئەو پیاوە لەسەر ئەم شـێوەیەی بمرێـت ، ئـەوا مردنەکـەی لەسەر ئـاینی ( محمـــد ) ناژمێردرێـت ﷺ ، دەنـووك دەدات لـە زەوی هـەروەکو چـۆن

---

[٣١٥] واتە : لە پشتەوە ، هەروەکو لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە .

دەڵێم : ئەم بیننە بینینی ئاساییە ، و یەکێکە لە موعجیزەکانی پەیامبەری خوا ﷺ ، ئەوەش تایبەتە بـە کاتی نوێژەوە ، و هیچ بەڵگەیەك نیە لە سەر گشتێتی ئەو بینینە .

[٣١٦] البخاري ومسلم .

[٣١٧] أبو يعلى في ( مسنده : ٣٤٠ و ٣٤٩ / ١ ) ، والآجري في " الأربعين " ، والبيهقي والطبراني ( ١ / ١٩٢ / ١ ) والضياء في ( المنتقى من الأحاديث الصحاح و الحسان : ٢٧٦ / ١ ) ، وابن عـــساكر ( ٢ / ٢٢٦ / ٢ و ٤١٤ / ١ و ٨ / ١٤ / ١ و ٧٦ / ٢ ) بسند حسن ، وصححه ابن خزيمة ( ١ / ٨٢ / ١ ) ، ولطرفه الأول دون الزيادة شاهد مرسل عند ابن بطة في ( الإبانة : ٥ / ٤٣ / ١ ) .

قەلەڕەش دەنووك لە خوێن دەدات ، نموونەی ئەو کەسەش کە کڕنووشەکەی بە تەواوی نابات ، سوژدەکەشی وەکو ئەوەیە کە دەنووك لە زەوی بدات ، وەکو پیاوێکی برسی یە خورمایەك یان دوو خورما دەخوات ، و هیچ سوودێکی پێناگەیەنێت .

وە ( أبو هريرة ) رضي الله عنه فەرموویەتی : خۆشەویستەکەم نەهی لێ کردووم کە دەنووك لە زەوی بدەم هەروەکو چۆن کەڵەباب ( کەڵەشێر ) دەنووك لە زەوی دەدات ، وە لەوەش کە لە نوێژەکەمدا لا بکەمەوە هەروەکو چۆن ڕێوی لا دەکاتەوە ، وە لەوەش کە داشبنیشم هەروەکو چۆن مەیموون دادەنیشێت [٣١٨] .

وە فەرموویەتی : " أسوأ الناس سرقة الذي يسرق من صلاته " ، واتە : خراپترین دز لە خەڵکیدا ئەو کەسەیە کە دزی لە نوێژەکەیدا بکات ، هاوەڵانی فەرموویان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چون دزی لە نوێژەکەی دەکات ؟ ئەویش فەرمووی : " لا يتم ركوعها وسجودها " [٣١٩] ، واتە : کڕنووش و سوژدەکانی بە تەواوی نابات .

وە ـ جارێکیان ـ " نوێژی دەکرد ، لاچاوی کەوتە سەر پیاوێك لە کڕنووش و سوژدەکانیدا پشتی بە تەواوی ڕاست نەدەکردەوە ، کە لە نوێژەکەی بووەوە فەرمووی : " يا معشر المسلمين إنه لا صلاة لمن لا يقيم صلبه في الركوع والسجود " [٣٢٠] ، واتە : ئەی موسڵمانان ، نوێژی تەواو نیە ئەو کەسەتان کە لە کڕنووش و سوژدەدا پشتی بە تەواوی ڕاست نەکاتەوە .

وە لە فەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی : " لا تجزىء صلاة الرجل حتى يقيم ظهره في الركوع و السجود " [٣٢١] ، واتە : هیچ کەسێك نوێژی لەسەر ناکەوێت تاکو لە کڕنووش و سوژدەکانیدا پشتی ڕاست نەکاتەوە .

---

[٣١٨] أخرجه الطيالسي وأحمد وابن أبي شيبة ، وهو حديث حسن ؛ كما بينته في تعليقي على " الأحكام " للحافظ عبد الحق الإشبيلي ( ١٣٤٨ ) .

[٣١٩] ابن أبي شيبة ( ١ / ٨٩ / ٢ ) والطبراني والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

[٣٢٠] ابن أبي شيبة ( ١ / ٨٩ / ١ ) وابن ماجة وأحمد بسند صحيح ، وانظر ( الصحيحة : ٢٥٣٦ ) .

[٣٢١] أبو عوانة وأبو داود والسهيلي ( ٦١ ) وصححه الدارقطني .

# زیکرەکانی کڕنووش

پەیامبەری خوا ﷺ لەم ڕوکنەدا جۆرەها زیکر و پاڕانەوەی دەکرد ، جارێك بەمەو جارێکی تر بەوی تریان :

١ ـ سێ جار " سبحان ربـي العظيم " ـی دەووت [٣٢٢] .

وە هەندێك جاریش زیاد لە سێ جار دووبارەی دەکردەوە [٣٢٣] .

وە جارێکیان لە شەو نوێژێکدا ئەوەندە دووبارەی کردەوە ، بەشێوەیەك کڕنووشەکەی نزیك قورئان خوێندنەوەکەی بوو ، خوێندنەوەکەشی تێیدا سێ سورەت بوو لە سورەتە درێژەکانی قورئانی پیرۆز : سورەتی ﴿ البقرة ﴾ ، و ﴿ النساء ﴾ ، و ﴿ آل عمران ﴾ ، لە نێوانیانیشدا پاڕانەوە و داوای لێ خۆشبوونیشی دەکرد هەروەکو لە پێشدا لە باسی ( شەو نوێژ ) ـدا باسکرا .

٢ ـ سێ جار " سبحان ربـي العظيم وبحمده " ـی دەووت [٣٢٤] .

٣ ـ وە " سبوح قدوح [٣٢٥] رب الملائكة والروح " ـی دەووت [٣٢٦] .

٤ ـ وە " سبحانك اللهم وبحمدك اللـهم اغفـر لي " ـی بەزۆری لە کڕنووش و سوژدەکانیدا دەووت ، ئەوەشی لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگرتبوو ( يتأول القرآن ) [٣٢٧] .

---

[٣٢٢] أحمد وأبو داود وابن ماجة والدارقطني والطحاوي والبزار وابن خزيمة ( ٦٠٤ ) والطبراني في " الكبير " عن سبعة من الصحبة ، ففيه رد على من أنكر ورود التقيد بثلاث تسبيحات ؛ كابن القيم وغيره .

[٣٢٣] ئەم سوودە لەو فەرموودانەوە وەردەگیرێت کە ئاماژە بەوە دەکەن کە پەیامبەری خوا ﷺ وەستان و کڕنووش و سوژدەکانی هاوشێوەی یەك بوون ، هەروەکو لە دوای ئەم بابەتەدا دێت .

[٣٢٤] صحيح ، رواه أبو داود والدارقطني وأحمد والطبراني والبيهقي .

[٣٢٥] پێشەوا ( أبو إسحاق ) فەرموویەتی : ( السبوح ) : ئەوەیە کە پاك ڕابگیرێت لە هەموو خراپەیەك . وە ( القدوس ) : بەپیت و بەفەڕ و بەبەرەکەت ، وە ووتراوە واتاکەی : پاك وخاوێنە . وە ( ابن سيده ) فەرموویەتی : ( سبوح قدوس ) لەسیفەتەکانی خوای پەروەردگارە ، چونکە ( يسبح و يقدس ) . ( لسان العرب ) .

[٣٢٦] مسلم وأبو عوانة .

٥ ـ وە " اللهم لك ركعت وبك آمنت ولك أسلمت [ أنت ربي ] خشع لك سمعي وبصري ومخي وعظمي ( وە لە ڕیوایەتێکی تردا هـاتووە : وعظامي ) وعـصبي [ ومـا استقلت به قدمي لله رب العالمين ] " ـی دەووت (٣٢٨) .

٦ ـ وە " اللهم لك ركعت وبك آمنت ولك أسلمت وعليك توكلت أنـت ربي خشع سمعي وبصري ودمي ولحمي وعظمي وعصبي لله رب العالمين " ی دەووت (٣٢٩) .

٧ ـ وە " سبحان ذي الجبروت والملكوت (٣٣٠) والكبرياء والعظمـة " ی دەووت ، ئەمەی حەوتەمی لە شەونوێژدا دەووت (٣٣١) .

---

(٣٢٧) البخاري ومسلم ، واتای ( يتأول القرآن ) ئەوەیە : کە کرداری بەوە دەکرد کە قورئانی پیرۆز فەرمانی پێ دەکرد ، واتە : هەروەکو لەو ئایەتەی کە خـوای پـەروەردگار تێیـدا فەرمووێـەتی : ﴿ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا ﴾ ( النصر : ٣ ) .

(٣٢٨) مسلم وأبو عوانة والطحاوي والدارقطني ، وە واتای ( وما استقلت ) ئەوەیە : ئـەوەی لـە سـەریەوەیە وهەڵی دەگرێت ، ( الإستقلال ) : بەواتای بەرزبوونەوەیە ، ئەوەش گشتی کردنە دوای تایبەت کردنی .

(٣٢٩) النسائي بسند صحيح .

(٣٣٠) ئەم دوو وشەیە ( مبالغة ) ـەن لە ووشەی ( الجبر ) وەرگیراون : واتە : بە توانا و بە دەسـەڵات ، و لـە ووشەی ( الملك ) : کە واتاکەی : بەڕێوەبەرایەتیە ، واتە : خاوەن توانا و دەسەڵاتە و بەڕێوەبەری تـەواوە کـە گەشتووەتە ئەو پەڕی تەواوی .

(٣٣١) أبو داود والنسائي بسند صحيح .

( **سوودێك** ) : ئایا ڕەوایە هەموو ئەم زیکرانە لە کڕنووشێکدا کۆبکرێنەوە یان نە ؟

زانایان بۆچوونی جیاوازیان لەو بارەیەوە هەیە ، وە پێشەوا ( ابن القيم ) لە کتێبـی ( الـزاد ) ـدا ڕاڕابـووە لـەم بابەتەدا ، بەڵام پێشەوا ( النووي ) لە ( الأذكار ) ـدا بۆچوونی یەکەمی هەڵبژاردووە ، و فەرموویەتی : " باشـتر وایە هەموو ئەم زیکرانە لە گەڵ یەکدا کۆبکرێتەوە ئەگەر بتوانێت ، بەهەمان شێوە لە کردارەکانی تردا پێویستە هەمان ئیش ئەنجام بدات " ، وە ( أبو الطيب صديق حسن خان ) لە ( نزل الأبرار : ٨٤ ) سەبارەت بەم ووتەیەی پێشەوا ( النووي ) فەرموویەتی : " جارێك ئەمە دەکات و جارێکی تر ئەوی تریان ، وە هیچ بەڵگەیـەك نابـینم لەسەر کۆکردنەوەی ئەو زیکرانە ، وە پەیامبەری خوا ﷺ ئەو زیکرانەی لە یەك کرداردا کۆ نەدەکردەوە ، بـەڵکو جارێك ئەمەیان دەڵێت و جارێکی تر ئەویتریان ، شوێن کەوتنیش چاکترە لە بیدعەکردن " .

## درێژکردنەوەی کڕنووش

وە پەیامبەری خوا ﷺ کڕنووش ، و هەستانەوەی دوای کڕنووش ، و سوژدە ، و دانیشتنی لە نێوان سوژدەکانی ، نزیك بوون لەیەکەوە لەڕووی یەکسانیەوە [٣٣٢] .

## نەهی کردن لە خوێندنەوەی قورئان لە کڕنووشدا

وە نەهیشی دەکرد لە خوێندنەوەی قورئان لە کڕنووش و سوژدەدا [٣٣٣].

وە دەیفەرموو : " ألا وإني نهيت أن أقرأ القرآن راكعا أو ساجدا ، فأما الركوع فعظموا فيه الرب عز وجل ، وأما السجود فاجتهدوا في الدعاء ، فقَمن [٣٣٤] أن يستجاب لكم " [٣٣٥] ، واتە : من ئەوەم لێ قەدەغە کراوە لە کڕنووش و لە سوژدەدا قورئان بخوێنم ، جا لە کڕنووشدا گەورەیی پەروەردگارتان دەربڕن ، و لە سوژدەکانیشتان زۆر لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە ، نزیك و شایستەیە وەڵام بدرێنەوە .

---

ئەمەش بۆچونی ڕەوایە - إن شاء الله تعالى - ، بەڵام لە سوننەتدا واریدە کە ئەم کردارە جگە لەمیش درێژکراوەتەوە ، هەروەکو لە باسەکانی تردا باسی لێوە دەکەین بەشێوەیەك درێژ دەکرێتەوە کە هاوشێوەی وستانە ، جا ئەگەر نوێژگەر ویستی شوێنکەوتەی پەیامبەری خوا ﷺ بێت لەم سوننەتەدا ، ئەوا ناتوانێت ئەو کردارە ئەنجام بدات ئیللا لە سەر بۆچونەکەی پێشەوا ( النووي ) بێت کە بریتیە لە کۆکردنەوەی ئەو زیکرانە ، ئەو بۆچونەش بۆچونی ( عطاء ) ـە کە ( ابن نصر ) لە ( قيام الليل : ٧٦ ) ـدا ، لە ( ابن جرير ) ـەوە لە ( عطاء ) ـەوە دەیگێڕێتەوە ، ئەگەر نە لەسەر بۆچونی دووبارەکردنەوەی ئەو زیکرانە کە لە هەندێك لە ڕیوایەتەکاندا هاتووە ، ئەم بۆچونەش نزیکترە لە سوننەتەوە . والله أعلم .

[٣٣٢] البخاري ومسلم ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٣١ ) .

[٣٣٣] مسلم وأبو عوانة ، نەهیەکەش گشتیە نوێژە فەرز و سوننەتەکانیش دەگرێتەوە ، سەبارەت بەو زیادەیەش کە ( ابن عساكر ) لە ( ١٧ / ٢٩٩ / ١ ) ـدا دەیگێڕێتەوە ، زیادەیەکی ( شاذة ) یان ( منكرة ) ، بۆیە هەر خودی ( ابن عساكر ) بە ( علة ) ت داری داناوە ، بۆیە نابێت ئیشی پێ بکرێت .

[٣٣٤] بكسر الميم و فتحها ؛ أي : جدير و خليق ، واتە : شایستەیە .

[٣٣٥] مسلم وأبو عوانة .

## ڕاست بوونەوە لە کڕنووش و ئەو زیکرەی کە تێیدا دەووترێت

پاشان " پەیامبەری خوا ﷺ پشتی لە کڕنووش ڕاست دەکردەوە ، و دەیفەرموو : ( سمع الله لمن حمده ) " (٣٣٦) .

وە فەرمانیشی کردووە بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بەتەواوی ئنجام نەداوە ، و فەرموویەتی : " لا تتم صلاة لأحد من الناس حتى ... يكبر ... ثم يركع ... ثم يقول : سمع الله لمن حمده حتى يستوي قائما " (٣٣٧) ، واتە : نوێژی هیچ کەسێك لە موسڵمانان تەواو نیە تاکو ... تەکبیرەی ئیحرام دانەبەستێت ... پاشان کڕنووش ببات ... پاشان بڵێت : سمع الله لمن حمده ، تاکو پشتی ڕاست دەبێتەوە .

وە ئەگەر سەری لە کڕنووش بەرز بکردایەتەوە ، ڕێك دەبووەوە تاکو هەموو بڕبڕەکانی پشتی جێی خۆیان دەگرتەوە ... (٣٣٨) .

پاشان " کە ڕاست ڕادەوەستا دەیفەرموو : ( ربنا [ و ] لك الحمد ) " (٣٣٩) .

وە فەرمانیشی بەو کارە کردووە بە هەموو نوێژگەرێك مەئموم بێت یان جگە لەو ، و فەرموویەتی : " صلوا كما رأيتموني أصلي " (٣٤٠) ، واتە : نوێژ بکەن هەروەکو چۆن منتان بینیوە نوێژ دەکەم .

وە دەیفەرموو : " إنما جعل الإمام ليؤتم به ... وإذا قال : سمع الله لمن حمده ؛ فقولوا : ( [ اللهم ] ربنا ! ولك الحمد ) ؛ يسمع الله لكم ، فإن الله تبارك وتعالى قال على لسان

---

(٣٣٦) البخاري ومسلم .

(٣٣٧) أبو داود والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

(٣٣٨) البخاري وأبو داود ، ( صحيح أبي داود : ٧٢٢ ) ، و ( الفَقَار ) بالفتح : ما انتضد من عظام الصلب من لدن الكاهل إلى العَجب ؛ كما في " القاموس " وانظر " فتح الباري " ( ٢ / ٣٠٨ ) .

(٣٣٩) البخاري وأحمد .

(٣٤٠) البخاري وأحمد .

نبيه ﷺ : سمع الله لمن حمده " [٣٤١] ، واته : پێشنوێژ دانراوه بۆ ئەوەی لاسایی بكرێتەوه ... جا ئەگەر وتی : سمع الله لمن حمده ، ئەوا بڵێن : اللهم ! ربنا و لك الحمد ، خوای پەروەردگار بیسەرتان دەبێت ، چونكە خوای پەروەردگار لەسەر زمانی پەیامبەرەكەی ﷺ فەرموویەتی : خوای پەروەردگار بیسەری ئەو كەسانە بێت كە شوكری دەكەن .

وه هۆكاری ئەوەشی بەوە هێناوەتەوه ، لە فەرموودەیەكی تردا كە فەرموویەتی : " فإنه من وافق قوله قول الملائكة ؛ غفر له ما تقدم من ذنبه " [٣٤٢] ، واته : ئەو كەسەی وتەكەی لە گەڵ وتەی فریشتەكانی خوای پەروەردگاردا هاوكات بێت ، ئەوا خوای پەروەردگار لە هەموو گوناهەكانی ڕابردووی خۆش دەبێت .

وه دەستەكانی لە كاتی ئەم ڕاست بوونەوەدا بەرز دەكردەوه [٣٤٣] ، بەو شێوەیەی پێشوو كە لە تەكبیرەی ئیحرامدا باسكراوه ، وه كە ڕاست دەبووەوه دەیفەرموو :

---

(٣٤١) مسلم وأبو عوانة وأحمد وأبو داود .

**بیرخستنەوەیەك** : ئەم فەرموودەیە ئەوە ناگەیەنێت كە ئەو كەسانەی لە دوای پێشنوێژ نوێژ دەكەن بەشداری ناكەن لە وتنی : ( سمع الله لمن حمده ) ، هەروەها ئەوەش ناگەیەنێت كە پێشنوێژ بەشداری ئەو كەسانە ناكات كە لە دوایەوه نوێژ دەكەن لە وتنی : ( ربنا ولك الحمد ) ، چونكە ئەم فەرموودەیە لەو بارەیەوه نەهاتووه كە پێشنوێژ یان ئەو كەسانە كە لە دوایەوه نوێژ دەكەن چی دەڵێن لەم كردارەدا ، بەڵكو بۆ دەرخستنی ئەوەیە كە وتنی: ( ربنا ولك الحمد ) ـی مەئموم دوای بیستنی وتەی پێشنوێژە كە دەڵێت : ( سمع الله لمن حمده ) ، ئەوەش كە پشتگیری لەم بۆچونە بكات ئەوەیە كە پەیامبەری خوا ﷺ سەرەڕای ئەوەی كە پێشنوێژیش بوو دەیوت : ( ربنا ولك الحمد ) ، هەروەها گشتێتی وتەی پەیامبەری خوا ﷺ كە فەرموویەتی : " صلوا كما رأيتموني أصلي " ئەوە دەگەیەنێت كە ئەبێت مەئموم ئەو شتانە بڵێت كە پێشنوێژ دەیڵێت وەكو وتنی : ( سمع الله لمن حمده ) و جگە لەویش ، جا با ئەو بەرێزانەی پرسیاریان لێكردووین سەبارەت بەو شتانە لەم وتەیە تێبگەن ، بەڵكو ئەوەی كە باسمان كردووه قەناعەتیان پێبكات .

ئەو كەسەش كە ئەیەوێت زیاتر لەو بارەیەوه بزانێت با بڕوانێتە : " دفع التشنيع في حكم التسميع " ـی پێشەوا ( الحافظ السيوطي ) لەو بارەیەوه كە لە پەتوكی ( الحاوي للفتاوى : ١ / ٥٢٩ ) باس دەكات .

(٣٤٢) البخاري ومسلم وصححه الترمذي .

(٣٤٣) البخاري ومسلم ، ئەم دەست بەرزكردنەوەیە بە ( متواتر ) ـی لە پەیامبەری خواوه ﷺ پێمان گەیشتووه ، و زۆربەی زانایان ئەوەیان جێگیر كردووه ، هەندێك لە ( حنفي ) مەزهەبەكانیش ، بڕوانە ( تعليق ) ـی پێشوو .

١ ـ " ربنا ولك الـحمد " [٣٤٤] .

٢ ـ وە جاری وا هەبوو دەیفەرموو : " ربنا لك الـحمد " [٣٤٥] .

٣ ـ وە هەندێك جاریش " اللهم " ی زیاد دەکرد بۆ ئەو دوو ڕستەیەی سەرەوە[٣٤٦] .

٤ ـ وە فەرمانیشی بەوە دەکرد ، و دەیفەرموو : " إذا قال الإمام سمع الله لمن حمده ؛ فقولوا : اللهم ! ربنا لك الحمد ، فإنه من وافق قوله قول الملائكة ؛ غفر له ما تقدم من ذنبه " [٣٤٧] ، واتە : ئەگەر پێشنوێژ ووتی : سمع الله لمن حمده ، ئەوا بڵـێن : اللهم ربنا لك الحمد ، چونکە هەر کەسێك ووتەکەی لە گەڵ ووتەی فریشتەکانی خوای پەروەردگاردا جووت بێت ، ئەوا خوای پەروەردگار لە هەموو گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت .

وە هەندێك جاریش یەکێك لەم زیکرانەی بۆ زیاد دەکردن :

٥ ـ " ملء السماوات وملء الأرض ومل ما شئت من شيء بعد " [٣٤٨] .

٦ ـ وە یان " ملء السماوات و [ ملء ] الأرض ، وما بينهما ، وملء ما شئت من شيء بعد " [٣٤٩] ی بۆ زیاد دەکرد .

٧ ـ وە جاری واش هەبوو ئەمەی بۆ زیاد دەکرد " أهل الثناء والمجد ، لا مانع لما أعطيت ، ولا معطي لما منعت ، ولا ينفع ذا الجَد [٣٥٠] منك الجد " [٣٥١] .

---

[٣٤٤] البخاري ومسلم .

[٣٤٥] البخاري ومسلم .

[٣٤٦] البخاري وأحمد ، وقد سها ابن القيم رحمه الله تعالى ، فأنكر هذا في " الزاد " صحة هذه الرواية الجامعة بين " اللهم " و " الواو " ، مع أنها في " صحيح البخاري " و " مسند أحمد " والنسائي من طريقين عن أبي هريرة ، وعند الدارمي من حديث ابن عمر ، وعند البيهقي عن أبي سعيد الخدري ، وعند النسائي أيضا من حديث أبي موسى الأشعري في رواية عنه .

[٣٤٧] البخاري ومسلم وصححه الترمذي .

[٣٤٨] مسلم وأبو عوانة .

[٣٤٩] مسلم وأبو عوانة .

٨ ـ وە هەندێك جار زیادكردنەكەی ئەمە بوو " ملء السماوات ، وملء الأرض ، وملء ما شئت من شيء بعد ، أهل الثناء والمجد ، أحق ما قال العبد ، وكلنا لك عبد [ اللهم !] لا مانع لما أعطيت ، [ ولا معطي لما منعت ] ، ولا ينفع ذا الجد منك الجد " [٣٥٢] .

وە جاری واش هەبوو لە شەو نوێژەكانیدا دەیفەرموو :

٩ ـ " لربي الحمد لربي الحمد " و دووبارەی دەكردەوە ، تاكو درێژی وەستانی یەكەمی نزیك دەبووەوە لە كڕنووشەكەی ، وەستانەكەشی سورەتی : ﴿ البقرة ﴾ ـەی تێدا خوێندبووەوە [٣٥٣] .

١٠ ـ " ربنا ! ولك الحمد ، حمداً كثيراً طيباً مُباركاً فيه ، [ مباركاً عليه ؛ كما يحب ربنا ويرضى ] " .

ئەم زیكرە پیاوێك ووتی كە لە دوای پەیامبەرەوە ﷺ نوێژی دەكرد ، دوای ئەوەی كە پەیامبەری خوا ﷺ سەری بەرزكردەوە لە ڕكاتەكەی ، و فەرمووی : ( سمع الله لمن حمده ) ، كە پەیامبەری خوا ﷺ لە نوێژەكەی بووەوە فەرمووی : ئەوە كێ بوو ئێستا قسەی كرد ، پیاوەكە فەرمووی : من بووم ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمووی : " لقد رأيت بضعة وثلاثين ملكاً يبتدرونها أيهم يكتبها أولا " [٣٥٤] ، واتە : سی و شتێك فریشتەم بینی پێشبڕكێیان دەكرد كامیان پێش هەموویان بینووسێتەوە .

---

[٣٥٠] بفتح الجيم على الصحيح : واتاكەشی : بەش و گەورەیی و دەسەڵاتە ، واتە : ئەو كەسەی كە بەشدراوە لە دونیادا بەشەكەی سامان بێت یان ئەوە یان گەورەیی و دەسەڵات لەلای تۆ بێ سوودە ، بەواتایەكی تر : ئەوەی كە پێی بەخشراوە لە تۆ ڕزگاری ناكات ، بەڵكو ئەوەی كە ڕزگاری دەكات تەنها كردەوە چاكەكانیەتی .

[٣٥١] مسلم وأبو عوانة .

[٣٥٢] مسلم وأبو عوانة وأبو داود .

[٣٥٣] أبو داود والنسائي بسند صحيح ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٣٥ ) .

[٣٥٤] مالك والبخاري وأبو داود .

## درێژکردنەوەی ئەم ڕاوەستانە ، و
## واجب بوونی ئارامگرتنی ئەندامەکان تێیدا

وە پەیامبەری خوا ﷺ ئەم ڕاست بونەوەی ئەوەندە درێژ دەکردەوە ، نزیك دەبـووەوە لە درێژی کڕنووشەکەی هەروەکو لە پێشدا باسـکرا ، بگـرە " جـاری وا هـەبوو ئەوەنـدە درێژی دەکردەوە ، لە وانەیە کەسێك بیوتایە : ڕەنگە لە بیری چـووبێت [ لـە بـەر زۆری مـانەوەی تێیدا ] " [٣٥٥] .

وە فەرمانیشی بە ئارامگرتن دەکرد تێیـدا ، هـەروەکو بـەو پیـاوەی فـەرمووکـە نوێژەکەی بەتەواوی ئەنجام نەدا : " ثم ارفع رأسك حتى تعتدل قائما [ فيأخذ كل عظـم مأخذه ] ، واتە : سەرت بەرز بکەرەوە تاکو ڕێك دەبیتەوە و هەموو ئێسکێك شوێن خۆی دەگرێتەوە ، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : " وإذا رفعت فأقم صلبك ، وارفع رأسك حتى ترجع العظام إلى مفاصلها " [٣٥٦] ، واتە : ئەگەر هەستایتەوە پشتت ڕاست بکـەرەوە ، و سەریشت بەرز بکەرەوە ، تاکو هەموو ئێسکێك شوێن خۆی دەگرێتەوە .

---

[٣٥٥] البخاري ومسلم وأحمد ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣٠٧ ) .

[٣٥٦] البخاري ومسلم بالجملة الأولى فقط والدارمي والحاكم والشافعي وأحمد .

مەبەستیش بە ( العظام ) لێرەدا : ئێسکەکانی بڕبڕەی پشتە [ واتە : فەقەراتەکان ] ، هەروەکو لــە بابەتی : ( هەستانەوە لە کڕنووش ... ) باسمان لێوەکرد ، وە ( المفاصل ) یش ، واتە : شوێنی بەیەك گەیشتنی هەموو دوو ئێسکێکە لە لەش . بڕوانە " المعجم الوسيط " .

**بیرخستنەوەیەك :** مەبەست لەم فەرموودەیە زۆر ڕوون و ئاشکرایە ، ئەوەش ئارام گرتنە لـەم وەسـتانەدا ، بەڵام سەبارەت بەوەی کە ئەم فەرموودەیە بکرێت بە بەڵگە بۆ بە شەرعی دانانی دەستی ڕاست لە سەر دەستی چەپ لەم وەستانەدا ، هەروەکو هەندێك لە برایانی حیجازمان کردوویانەتە بەڵگـە ، ئـەو کردنـە بەڵگەیـە کارێکی دوورە لە گۆ ( لفظ ) ـی هەموو ڕیوایەتەکانی ئەو فـەرموودەیە ـ کـە لای زانـایان بە فەرمـوودەی ( حديث المسيء صلاته ) ناسراوە ـ بەڵکو ئەو جۆرە کردنە بەڵگەیە کارێکی پووچەڵە ، چونکە ئـەو دەسـت دانانەی کە باسی لێوە دەکەن لە هیچ گـۆ ( لفظ ) ، و ڕیوایەتـەکانی فەرموودەکـە نـەهاتووە ، لـە باسـی ڕاوەستانی یەکەمدا ، جا نازانم چی دەبێتە بەڵگە بۆ دانانی دەستی ڕاست لە سـەر دەسـتی چـەپ لـە دوای

وه ئەوەی پێ ووت کە : " أنه لا تتم صلاة لأحد من الناس إذا لم يفعل ذلك " ، واتە : نوێژی هیچ کەس لە موسڵمانان تەواو نیە ئەگەر ئەوە ئەنجام نەدات .

وە دەیفەرموو : " لا ينظر الله عز وجل إلى صلاة عبد لا يقيم صلبه بين ركوعها وسجودها " [٣٥٧] ، واتە : خوای پەروەردگار سەیری نوێژی بەندەیەك ناكات ، ئەگەر لە نێوان كڕنووش و سوژدەكانیدا پشتی تەواو ڕاست نەكاتەوە .

---

كڕنووش ، ئەمە ئەگەر گوێ ڕیوایەتەكان یارمەتی ئەوەبدەن لێرەدا ، ئەی چۆن دەبێت ئەگەر بەئاشكرایی ئاماژە بكات بۆ پێچەوانەكەی ؟! پاشان ئەو دانانەی كە باس دەكرێت جێی گومان نیە كە لە فەرموودەكەوە دەرناكەوێت ، چونكە مەبەست بە( العظام ) : ئێسكەكانی بڕبڕەی پشتە هەروەكو لە پێشدا باسكرا ، ئەوەش كە پاڵپشتی ئەم ووتەیە بێت ئەوەیە كە لە كرداری پەیامبەری خواوە ﷺ هاتووە : " ... استوى حتى يعود كل فقار مكانه " جا تێبفكرێ و لەسەر هەق بە .

گومانیشم لەوەدا نیە كە دانانی دەستەكان لە سەر سینگ لەم وەستانەدا بیدعەو گومڕاییە ، چونكە بە هیچ شێوازێك نەهاتووە لەو فەرموودانەی كە باسی نوێژ دەكەن ـ چەندیش زۆرن ـ بۆیە ئەگەر بنەوایەكی هەبوایە ئەوا پێمان دەگەشت با لە یەك ڕیوایەتیشەوە بێت ، ئەوەش پاڵپشتی ئەوە بێت ئەوەیە كە هیچ كەسێك لە پێشین ( سلف ) كرداریان پێنەكردووە ، وە هیچ لە فەرموودە ناسان ئەمەیان نەگێڕاوەتەوە لە سنووری زانینی مندا .

وە ئەوەش كە شێخ ( التويجري ) لە " رسالة " ـەكەیدا دەیگێڕێتەوە ( ص ١٨ ـ ١٩ ) لە پێشەوا أحمد ـ بە ڕەحمەت بێت ـ پێچەوانەی ئەم ووتەیە نیە كە فەرموویەتی : " إن شاء أرسل يديه بعد الرفع من الركوع ، وإن شاء وضعهما ( هذا معنى ما ذكره صالح ابن الإمام أحمد في " مسائله " ( ص ٩٠ ) عن أبيه ) ؛ لأنه لم يرفع ذلك إلى النبي ﷺ ، وإنما قاله باجتهاده ورأيه ، والرأي قد يخطيء ، فإذا قام الدليل الصحيح على بدعية أمر ما ـ كهذا الذي نحن بصدده ـ فقول إمام به لا ينافي بدعيته ـ كما قرره شيخ الإسلام ابن تيمية ـ رحمه الله ـ في بعض كتبه ـ بل إنني لأجد في كلمة الإمام أحمد هذه ما يدل على أن الوضع المذكور لم يثبت في السنة عنده ؛ فإنه خيَّر في فعله وتركه ! فهل يظن الشيخ الفاضل أن الإمام يخير أيضا كذلك في الوضع قبل الركوع ؟! فثبت أن الوضع المذكور ليس من السنة ، وهو المراد .

هذه كلمة مختصرة حول هذه المسألة ، وهي تتحمل البسط والتفصيل ، ولا مجال لذلك هنا ، ومحله الرد الذي أشرت إليه في مقدمة الطبعة الخامسة من هذة الطبعة الجديدة .

[٣٥٧] أحمد والطبراني في " الكبير " بسند صحيح .

## ســــــوژده

پاشان " پەیامبەری خوا ﷺ ( الله أكبر ) ی دەکــرد ، و دەچــووە ســوژدەوە[٣٥٨] ، و فەرمانیشی کردووە بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ، و پێی فەرمووە : " لا تتم صلاة لأحد من الناس حتى ... يقول : سمع الله لمن حمده ، حتى يستوي قائمــا ثم يقول : ( الله أكبر ) ثم يسجد حتى تطمئن مفاصله "[٣٥٩] ، واتە : نوێژی هیچ کەسێك تــەواو نیە تاکو ... وە دەڵێت : سمع الله لمن حمده ، تاکــو ڕاست دەبێتەوە ، پاشان بڵێت : ( الله أكبر ) ، پاشان سوژدە ببات تاکو ئەندامەکانی تارام دەبن .

وە " ئەگەر بیویستایە سوژدە بەرێت ( الله أكبر ) ــی دەکرد ، [ دەستەکانیشی لــە لاکانی دوور دەکردەوە ] پاشان سوژدەی دەبرد "[٣٦٠] .

وە " هەندێك جار ئەگەر سوژدەی ببردایە دەستەکانی بەرز دەکردەوە "[٣٦١] .

---

[٣٥٨] البخاري ومسلم .

[٣٥٩] أبو داود والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

[٣٦٠] رواه أبو يعلى في ( مسنده : ق ٢/٢٨٤ ) بسند جيد ، وابن خزيمة (٢/٧٩/١) بسند آخر صحيح .

[٣٦١] النسائي والدارقطني والمخلص في ( الفوائد : ١ / ٢ / ٢ ) بسندين صحيح .

وقد رُوِيَ هذا الرفع عن عشرة من الصحابة ، وذهب إلى مشروعيته جماعة من السلف ، منهم : ابن عمــر ، وابن عباس ، والحسن البصري ، وطاوس ، وابنهُ عبد الله ، ونافع مولى ابن عمر ، وسالم ابنهُ ، والقاسم بــن محمد ، وعبد الله بن دينار ، وعطاء ، وقال عبد الرحمن بن مهدي : ( هذا من السنة ) ، وعمل به إمام السنة أحمد بن حنبل ، وهو قول مالك والشافعي .

# خۆبەردانەوە و ڕۆیشتن بۆ سوژدە لەسەر هەردوو دەست

وە " دەستەکانی پێش ئەژنۆکانی دەخستە سەر زەوی " (٣٦٢) .

وە فەرمانیشی بەوە دەکرد و دەیفەرموو : " إذا سجد أحدكم ؛ فلا يبرك كما يبرك البعير ، وليضع يديه قبل ركبتيه " (٣٦٣) ، واتە : ئەگەر هەرکەسێك لە ئێوە سوژدەی برد ، با وەکو ووشتر نەکات ، بەڵکو دەستەکانی پێش ئەژنۆکانی بخاتە سەر زەوی .

---

(٣٦٢) ابن خزيمة ( ١/٧٦/١ ) والدارقطني ، والحاكم وصححه ، ووافقه الذهبي ، وما عاضه من الحديث لا يصح ، وقد قال به مالك ، وعن أحمد نحوه كما في ( التحقيق : ١٠٨ / ٢ ) لابن الجوزي ، وقد روى المروزي في ( مسائله : ١/١٤٧/١ ) بسند صحيح عن الإمام الأوزاعي قال : " أدركت الناس يضعون أيديهم قبل ركبهم " .

(٣٦٣) أبو داود وتمام في ( الفوائد : ق ــ ١ / ١٠٨ ) والنسائي في ( الصغرى ) و ( الكبرى : ١ / ٤٧ ــ مصورة جامعة الملك عبد العزيز في مكة ) بسند صحيح ، وصححه عبد الحق في ( الأحكام الكبرى : ١ / ٥٤ ) وقال في ( كتاب التهجد : ١ / ٥٦ ) : ( إنه أحسن إسناداً من الذي قبله ــ يعني : حديث الوائل المعارض له ــ بل هذا ــ مع مخالفته لهذا الحديث الصحيح والذي قبله ــ لا يصح من قبل إسناده ــ ، وكذلك ما في معناه ، كما بينته في ( الضعيفة : ٩٢٩ ) و ( الإرواء : ٣٥٧ ) .

ئەوەش بزانە : کە پێچەوانە بوونەوەی ووشتر لەوەی دەستەکان پێش ئەژنۆکان دابنرێت ، ئەوەیە کە ووشتر یەکەم جار ئەژنۆکانی دادەنێ ، ئەژنۆکانیشی لە دەستیدان ، هەروەکو لە " لسان العرب " و جگە لەویشدا هاتووە لە پەرتوکەکانی زمانەوانیدا ، پێشەوا ( الطبراني ) یش ووتەیەکی هاوشێوەی ئەم ووتەیەی فەرمووە لە " مشكل الآثار " و " شرح معاني الآثار " ـدا ، هەروەها پێشەوا " الإمام القاسم السرقسطي " بە ڕەحمەت بێت ، ئەو پێشەوایە لە ( غريب الحديث : ٢ / ٧٠ / ١ ــ ٢ ) دا بۆمان دەگێڕێتەوە بە سەنەدێکی ( صحيح ) لە ( أبو هريرة ) ـەوە کە فەرموویەتی : " لا يبركن أحد بروك البعير الشارد " ، ئەم پێشەوایە فەرموویەتی : " ئەمە لە سوژدەدایە ، فەرموویەتی : خۆی بە یەك جار بەرنەداتەوە ـ هەروەکو چۆن ووشتری تاکی نائارامی شڵەژاو ئەنجامی دەدات ـ بەڵکو خۆی بەردەداتەوە بە ئارامی دەستەکانی پاشان ئەژنۆکانی دادەنێت ، فەرموودەیەکی ( مرفوع ) یش لەم بارەیەوە هاتووە ئەومان بۆ ئاشکرا دەکات " .

پاشان ئەو فەرموودەیەی سەرەوە دەگێڕێتەوە ، ئەوەی کە پێشەوا ( ابن القيم ) فەرموویەتی ووتەیەکی نامۆیە : " إنه كلام لا يعقل ، ولا يعرفه أهل اللغة " ، ئەوەش ئەم ووتەیە ڕەت بکاتەوە ئەو پەرتوکانەیە کە ئاماژەمان پێکردووە ، جگە لەوانەش زۆر سەرچاوەی تر هەن ، بابگەڕێنەوە بۆی وە بەتێر و تەسەلی باسم لەو شتە کردووە لە باسی وەڵام دانەوەم بۆ ( الشيخ التويجري ) ، هیوام وایە بڵاوبێتەوە .

وە دەیفەرموو : " إن اليدين تسجدان كما يسجد الوجه فإذا وضع أحدكم وجهه ؛ فليضع يديه ، وإذا رفع ؛ فليرفعهما " [٣٦٤] ، واتە : دەستەكانیش سوژدە دەبەن هەروەكو چۆن ڕوومەت سوژدە دەبات ، جا ئەگەر یەكێك لە ئێوە نێوچاوانی دانا با دەستەكانیشی دابنێت ، و ئەگەر بەرزی كردەوە با دەستەكانیشی بەرزبكاتەوە .

وە " تێیدا متمانەی دەكردە سەر دەستەكانی ، [ و ڕای دەخستن ] [٣٦٥] ، و پەنجەكانی دەلكاندن بە یەكەوە [٣٦٦] ، و ڕووی دەكردن لە قیبلە " [٣٦٧] .

وە " لە ئاستی شانەكانی دای دەنان " [٣٦٨] ، و هەندێك جاریش " لە ئاستی گوێكانی " [٣٦٩] .

وە " لووت و نێوچاوانی توووند دەكرد بە زەویەوە " [٣٧٠] .

وە بەو پیاوەی فەرموو كە نوێژەكەی بە تەواوی ئەنجام نەدا : " إذا سجدت ؛ فمكن لسجودك " [٣٧١] ، واتە : ئەگەر سوژدەت برد ئەندامەكانی سوژدەت لە زەویدا جێگیر بكە .

وە لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە فەرموویەتی : " إذا أنت سجدت ؛ فأمكنت وجهك ويديك ؛ حتى يطمئن كل عظم منك إلى موضعه " [٣٧٢] ، واتە : ئەگەر تۆ سوژدەت برد

---

[٣٦٤] ابن خزيمة ( ١/٧٩/٢ ) وأحمد والسراج وصححه الحاكم ووافقه الذهبي ، وهومخرج في ( الإرواء : ٣١٣ ) .

[٣٦٥] أبو داود والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

[٣٦٦] ابن خزيمة والبيهقي والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

[٣٦٧] البيهقي بسند صحيح ، وعند ابن أبي شيبة ( ١ / ٨٢ / ٢ ) والسراج توجيه الأصابع من طريق آخر .

[٣٦٨] أبو داود والترمذي وصححه هو وابن الملقن ( ٢ / ٢٧ ) ، وهومخرج في ( الإرواء : ٣٠٩ ) .

[٣٦٩] أبو داود والنسائي بسند صحيح .

[٣٧٠] أبو داود والترمذي وصححه هو وابن الملقن ( ٢ / ٢٧ ) ، وهومخرج في ( الإرواء : ٣٠٩ ) .

[٣٧١] أبو داود وأحمد بسند صحيح .

[٣٧٢] ابن خزيمة ( ١ / ١٠ / ١ ) بسند حسن .

با نێوچاوانت و دەستەکانت لە زەوی جێگیر بکەی ، تاکو هەموو ئیسکێکی جەستەت ئارام دەگرێت .

وە دەیفەرموو : " لا صلاة لمن لا يصيب أنفه من الأرض ما يصيب الجبين " [٣٧٣] ، واتە : نوێژی ئەو کەسە تەواو نیە کە لووتی لە زەوی نەدات ، هەروەکو چۆن نێوچاوانی لە زەوی دەدات .

وە " ئەژنۆکان و لێواری پەنجەکانی پێی لە زەوی جێگیر دەکرد " [٣٧٤] ، وە " ڕووی پێکان ، و لێواری پەنجەکانیانی دەکرد لە کەعبە " [٣٧٥] ، و" پاژنەکانیشی بەیەکەوە جووت دەکرد " [٣٧٦] ، و" پەنجەی پێکانیشی دەچەقاند بە زەویدا " [٣٧٧] ، و" فەرمانیشی پێکردووە " [٣٧٨] ، و پەنجەکانیشی ڕوو دەکرد لە کەعبە ( وكان يفتح أصابعهما ) [٣٧٩] ، وە دەیکردنەوە .

ئەمانەش حەوت ئەندامن سوژدەی لەسەر دەبردن : دەستەکان ، و ئەژنۆکان ، و پێکان ، و نێوچاوان ، و لووت .

وە پەیامبەری خوا ﷺ هەر دوو ئەندامەکەی کۆتایی ـ واتە : نێو چاوان و لووتی ـ بە ئەندامێك داناوە لە سوژدەدا ، و فەرموویەتی : " ( أمرت أن أسجد ( لە ڕیوایەتێکی

---

[٣٧٣] الدارقطني والطبراني ( ٣ / ١٤٠ / ١ ) وأبو نعيم في " أخبار أصبهان " .

[٣٧٤] البيهقي بسند صحيح ، وعند ابن أبي شيبة ( ١ / ٨٢ / ٢ ) والسراج توجيه الأصابع من طريق آخر (٣٦٣/٢) وصححه الحاكم ووافقه الذهبي .

[٣٧٥] البخاري وأبو داود ، والزيادة لابن راهويه في ( مسنده : ٢/١٢٩/٤ ) ، وروى ابن سعد ( ١٥٧/٤ ) عن ابن عمر أنه كان يحب أن يستقبل كل شيء منه القبلة إذا صلى ، حتى كان يستقبل بإبهامه القبلة .

[٣٧٦] الطحاوي وابن خزيمة رقم ( ٦٥٤ ) وصححه الحاكم ووافقه الذهبي .

[٣٧٧] البيهقي بسند صحيح .

[٣٧٨] الترمذي والسراج وصححه الحاكم ووافقه الذهبي .

[٣٧٩] أبو داود والترمذي وصححه ، والنسائي وابن ماجه ، و ( يفتخ ) بالخاء المعجمة ؛ أي : يغمز موضع المفاصل منها ، ويثنيها إلى باطن الرجل ؛ كما في " النهاية " .

تردا هاتووە : أمرنا أن نسجد ) علی سبع أعظم : علی الـجبهة ـ وأشار [٣٨٠] بیدە علی أنفه ـ والیدین ( وفي لفظ : الكفین ) ، والركبتین ، وأطراف القدمین ، ولا نكفت الثیاب والشعر [٣٨١] " [٣٨٢] ، واتە : فەرمانم پێكراوە سوژدە بەرم ( لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە : فەرمانمان پێكراوە سوژدە بەرین ) ، لەسەر حەوت ئەندام : لەسەر نێوچاوان ـ ئاماژەی بە دەستەكانی دەكرد بۆ لووتی ـ ، و هەردوو دەستەكان ، و ( وە لە گێڕ ( لفظ ) ێكی تردا هاتووە : هەردوو ناو لەپی دەستەكان ) ئەژنۆكان ، و لێواری پێكان ، و . . . .

وە دەیفەرموو : " إذا سجد العبد سجد معه سبعة آراب : وجهه ، وكفاه ، وركبتاه ، وقدماه " [٣٨٣] ، واتە : كە نوێژگەر سوژدە دەبات ، حەوت ئەندامی لە گەڵدا سوژدە دەبات : نێوچاوان ، و ناو لە پەكان ، و ئەژنۆكان ، و لێواری پێكان .

وە جارێكیان پیاوێكی بینی لە پشتی سەری پرچی كۆكردبووەوە ( رأسه معقوص [٣٨٤] ) ، پێی فەرموو : " إنما مثل هذا مثل الذي یصلي وهو مكتوف " [٣٨٥] ، واتە : نموونەی ئەم پیاوە وەكو كەسێكە بە بەستراوی نوێژ بكات .

---

[٣٨٠] هەروەكو ئەوەی بیەوێ بە ووشەی " ئاماژەكردن : أشار " ووشەی " فەرمان كردن : أمر " دەربڕێت ، بۆیە ( علی ) ـی بەكارهێناوە لە جیاتی ( إلی ) . هەروەكو لە " فتح " ـدا هاتووە .

[٣٨١] واتە : كۆكردنەوە ، و پاراستنی لـە بڵاوبوونـەوە ، مەبەسـتی : كۆكردنـەوەی پۆشـاك ، و پرچـە بـە دەستەكان لە كاتی كڕنووش و سوژدەدا . " النهایة " .

دەڵێم : ئەم نەهیكردنە تایبەت نیە بە كاتی نوێژەوە ، بەڵكو ئەگەر پۆشاكەكەی یان پرچی پێشنوێژ كۆكردەوە ، و پاشان بەو شێوەیە ڕۆشتە نوێژەكەیەوە ، بەهەمان شێوە نەهیەكە دەیگرێتەوە لە بۆچونی زۆربەی زانایان ، ئەوەش پاڵپشتی نەهیەكەی پەیامبەری خوا بكات ﷺ ئەوەیە كە نەهی كردووە لەوەی كە پیاو نوێژ بكات لە كاتێكدا پرچی كردبێ بە پەلكە یان لوولی كردبێت هەروەكو لە دواییدا ئاماژەی بۆ دەكرێت .

[٣٨٢] البخاري ومسلم ، وهومخرج في ( الإرواء : ٣١٠ ) .

[٣٨٣] مسلم وأبو عوانة وابن حبان .

وە ( آراب ) واتە : ئەندامەكان ، و كۆی ( إرب ) ـە بە ( كسر الهمزة وسكون الراء ) .

[٣٨٤] مسلم وأبو عوانة وابن حبان .

هەروەها فەرمووویەتی : " ذلك كفل الــشيطان " (٣٨٦) ، واتــه : ئــەوه جێگــەی دانیشتی شەیتانه ( واته : شوێنی کۆکردنەوەی پرچەکەی ) .

وه " باسکەکانی ڕا نەدەخست " (٣٨٧) ، بەڵکو " بــەرزی دەکردنــەوه لــه زەوی ، و دووری دەخستنەوه له لاکانی ، تاکو سپیایەتی بن باڵ ( بن هەنگڵ ) ــەکانی دەردەکەوت بۆ کەسێك له پشتی وەستابێت " (٣٨٨) ، و " به شێوەیەك ئەگەر بەرخێك ( بهمة (٣٨٩) ) بیویستایه به ژێر باڵەکانی تێپەڕێ پێپەر دەبوو " (٣٩٠) .

وه زۆر زیــادڕەوی تێدا دەکرد تــاکو هــاوەڵاتی دەیــانفەرموو : ئێمه دڵمان دەســووتا ( نأوي ونرق (٣٩١) ) بۆ پەیامبەری خوا ﷺ لەبەر ئەوەی ئەوەنده دەستەکانی له لاکانی دوور دەکردەوه که سوژدەی دەبرد " (٣٩٢) .

وه فەرمانیشی بەوه دەکرد ، و دەیفەرموو : " إذا سجدت فضع كفيك وارفع مرفقيك " (٣٩٣) ، واته : ئەگەر سوژدەت برد ناو لەپەکانت دابنێ ، وئانیشکەکانت بەرز بکەرەوه .

---

(٣٨٥) واته : کراو به پەلك ، و لولدراو ، پێشەوا ( ابن الأثير ) فەرمووویەتی : " واتای فەرموودەکه ئەوەیه : کــه ئەگەر پرچی پەرش و بلاوکرابێتەوه ، لەکاتی سوژدەبردندا دەکەوێته سەر زەوی وخاوەنەکەی بــەو کــردار پاداشــت دەدرێتەوه ، بەلام ئەگەر کرابێت به پەلك یان لوول درابــێت وەکــو ئــەوەی لێــدێت کــه ســوژدەی نــەبردبێت ، وه شوبهێنراوه به کۆتکراو ، چونکه دەستەکانی بەستراوەتەوه ، لەبەر ئەوەی لەکاتی سوژدەدا ناکەوێته زەوی .
دەڵێم : وادەردەکەوێت کــه ئــەم حوکمه تــایبەت بێت بــه پیــاوانەوه جگه لــه ئــافرەتــان ، هــەروەکو پێشەوا ( الشوكاني ) له ( ابن العربي ) ــەوه دەیگێڕێتەوه .

(٣٨٦) أبو داود والترمذي وحسنه ، وصححه ابن خزيمة وابن حبان ، و ( صحيح أبي داود : ٦٥٣ ) .

(٣٨٧) البخاري وأبو داود .

(٣٨٨) البخاري ومسلم ، وهومخرج في ( الإرواء : ٣٥٩ ) .

(٣٨٩) البهمة ؛ تاکه و کۆکەی ( البهم ) ــه ، واتاکەشی : بەرخه .

(٣٩٠) مسلم وأبو عوانة وابن حبان .

(٣٩١) واته : غەمبار بوون ، و دڵسووتان .

(٣٩٢) أبو داود وابن ماجه بسند حسن .

(٣٩٣) مسلم وأبو عوانة .

وە دەیفەرموو : " اعتدلوا في السجود ، ولا يبسط أحدكم ذراعيه انبساط ( وفي لفظ : كما يبسط ) الكلب " [٣٩٤] . وفي لفظ آخر وحديث آخر : " ولا يفترش أحدكم ذراعيه افتراش الكلب " [٣٩٥] ، واتە : لە سوژدەکانتان ڕێك بنەوە ، و دەستەکانتان ڕامەخەن هەروەکو چۆن سەگ دەستەکانی ڕا دەخات .

وە دەیفەرموو : " لا تبسط ذراعيك [ بسط السبع ] ، وادعم على راحتيك ، وتجاف [٣٩٦] عن ضبعيك ؛ فإنك إذا فعلت ذلك سجد كل عضو منك معك " [٣٩٧] ، واتە : دەستەکانت ڕامەخە هەروەکو چۆن دڕندە دەستەکانی ڕادەخات ، و لەسەر ڕانت دابنیشە ، و مەچەکەکانیشت لە خۆت دوور خەرەوە ، ئەگەر ئەوەت ئەنجام دا ، ئەوا هەموو ئەندامێکت لەگەڵتا سوژدە دەبات .

## واجبێتی ئارام گرتنی ئەندامەکان لە سوژدەدا

وە پەیامبەری خوا ﷺ فەرمانی بە تەواو ئەنجامدانی کڕنووش و سوژدە دەکرد ، نموونەشی بەوە ئەهێنایەوە بۆ کەسێك ئەوە ئەنجام نەدات ، بە کەسێکی برسی کە خورمایەك یان دوو خورما بخوات ، کە هیچ سوودێکی پێناگەیەنن ، وە دەیفەرموو : " إنه من أسوء الناس سرقة " ، واتە: خراپترین کەسە لە دزیدا .

وە حوکمیشی بە بەتاڵبوونی نوێژی ئەو کەسە دەدا کە لە کڕنووش ، و سوژدەیدا پشتی بە تەواوی ڕاست ناکاتەوە ، هەروەکو لە باسی کڕنووش بە ووردی باس کرا ، و فەرمانی کرد بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا بەوەی کە ئارام بگرێت لە سوژدەدا ، هەروەکو لەسەرەتای ئەم بابەتەشدا باسمان لێوە کرد .

---

[٣٩٤] البخاري ومسلم وأبو داود وأحمد .

[٣٩٥] أحمد والترمذي وصححه .

[٣٩٦] واتە : دورخستنەوە ، وە ( ضبعيك ) ، لە " النهاية " بەدا هاتووە : " الضبع بكسر الباء : وسط العضد " واتە : ناوەڕاستی مەچەکی .

[٣٩٧] ابن خزيمة ( ١ / ٨٠ / ٢ ) والمقدسي في " المختارة " والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

# زیکرەکانی سوژدە

پەیامبەری خوا ﷺ لەم ڕوکنەدا جۆرەها زیکر و پاڕانەوەی دەکرد ، جارێك بەمەو جارێکی تر بەوەی تریان :

١ ـ سێ جار ( سبحان ربي الأعلى ) ـی دەووت [٣٩٨] .

وە هەندێك جاریش زیاد لە سێ جار دووبارەی دەکردەوە [٣٩٩] .

وە جارێکیان لە شەو نوێژێکدا ئەوەندە دووبارەی کردەوە ، بەشێوەیەك سوژدەکەی نزیك قورئان خوێندنەکەی بووەوە ، خوێندنەوەکەشی تێیدا سێ سورەت بوو لە سورەتە درێژەکانی قورئانی پیرۆز : سورەتی : ﴿ البقرة ﴾ ، و ﴿ النساء ﴾ ، و ﴿ آل عمران ﴾ ، لە نێوانیانیشدا پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوونیشی دەکرد هەروەکو لە پێشدا لە ( شەو نوێژ ) ـدا باسکرا .

٢ ـ سێ جار ( سبحان ربي الأعلى و بحمده ) ـی دەووت [٤٠٠] .

٣ ـ وە " سبوح قدُّوس [٤٠١] رب الملائكة والروح " ـی دەووت [٤٠٢] .

٤ ـ وە " سبحانك اللهم ربنا ! وبحمدك ، اللهم اغفر لي " ـی بەزۆری لە ڕکووش و سوژدەکانیدا دەووت ، ئەوەشی لەقورئانی پیرۆزەوە وەرگرتبوو ( يتأول القرآن ) [٤٠٣] .

---

[٣٩٨] أحمد وأبو داود وابن ماجه والدارقطني والطحاوي والبزار ، والطبراني في " الكبير " عن سبعة من الصحابة ، وانظر التعليق على هذا الذكر في الركوع .

[٣٩٩] بڕوانە : ئەو ووتەیەی کە پێشتر لە سەر ئەم باسە ووتراوە .

[٤٠٠] صحيح ، رواه أبو داود والدارقطني وأحمد والطبراني والبيهقي .

[٤٠١] لە پێشتردا ئاماژە بەوە کرا کە ( السبوح ) ئەو زاتەیە کە دوور ڕادەگیرێت لە هەموو خراپەیەك ، و ( القدوس ) یش ، واتە : بە فەڕ و بە پیت و بە بەرەکەتە .

[٤٠٢] مسلم وأبو عوانة .

[٤٠٣] البخاري ومسلم ، ئەم زیکرە زیکری ڕکووشیشە ، وە لە پێشدا ووتمان کە واتاکەی ئەوەیە : کردار بەوە دەکات کە قورئانی پیرۆز فەرمانی پێدەکات .

٥ ـ وە " اللهم ! لك سجدت ، وبك آمنت ، ولك أسلمت ، [ وأنت ربي ] سجد وجهي للذي خلقه وصوَّره ، [ فأحسن صُوره ] ، وشق سمعه وبصره ، [ ف ] تبارك الله أحسن الخالقين " (٤٠٤) ـی دەووت .

٦ ـ وە " اللهم ! اغفر لي ذنبي كله ، ودِقَّه وجِلَّه ، وأوله وآخره ، وعلانيته وسره " (٤٠٥) ـی دەووت .

٧ ـ وە " سجد لك سوادي وخيالي ، وآمن بك فؤادي ، أبوء بنعمتك عليَّ ، هذي يدي وما جَنَيتُ على نفسي " (٤٠٦) ـی دەووت .

٨ ـ " سبحان ذي الجبروت والملكوت والكبرياء والعظمة " (٤٠٧) ، ئەمەو پاش ئەمەشی لە شەو نوێژدا دەووت .

٩ ـ " سبحانك [ اللهم ! ] وبحمدك ، لا إله إلا أنت " (٤٠٨) .

١٠ ـ " اللهم ! اغفر لي ما أسررت ، وما أعلنت " (٤٠٩) .

١١ ـ " اللهم ! اجعل في قلبي نورا ، [ وفي لساني نورا ] ، واجعل في سمعي نورا ، واجعل في بصري نورا ، واجعل من تحتي نورا ، واجعل من فوقي نورا ، وعن يميني نورا ، وعن يساري نورا ، واجعل أمامي نورا ، واجعل خلفي نورا ، [ واجعل في نفسي نورا ] وأعظِم لي نورا " (٤١٠) .

١٢ ـ " [ اللهم ! ] [ إني ] أعوذ برضاك من سخطك ، و [ أعوذ ] بمعافاتك من عقوبتك ، وأعوذ بك منك لا أحصي ثناء عليك ، أنت كما أثنيت على نفسك " (٤١١) .

---

(٤٠٤) مسلم وأبو عوانة والطحاوي والدارقطني .

(٤٠٥) مسلم وأبو عوانة .

(٤٠٦) ابن نصر والبزار والحاكم وصححه ورده الذهبي لكن له شواهد مذكورة في الأصل .

(٤٠٧) أبو داود والنسائي بسند صحيح ، واتاكەشی لە باسی کڕنووشدا باسکرا .

(٤٠٨) مسلم وأبو عوانة والنسائي وابن نصر .

(٤٠٩) ابن أبي شيبة ( ٦٢ / ١١٢ / ١ ) والنسائي وصححه الحاكم ووافقه الذهبي .

(٤١٠) مسلم وأبو عوانة وابن أبي شيبة في ( المصنف : ١٢ / ١٠٦ / ٢ و ١١٢ / ١ ) .

(٤١١) مسلم وأبو عوانة وابن أبي شيبة في ( المصنف : ١٢ / ١٠٦ / ٢ و ١١٢ / ١ ) .

## نەهی کردن لە خوێندنەوەی قورئان لە سوژدەدا

وە پەیامبەری خوا ﷺ نـەهی دەکـرد لـە خوێندنـەوەی قورئـان لـە کڕنـووش ، و سوژدەدا ، و فەرمانی دەکرد بە هەوڵدانی زۆر ، و زۆرکردنی پاڕانەوە لەم ڕووکنەی نوێژدا ، هەروەکو لە باسی کڕنووش دا باسمان لێوەکرد .

وە دەیفەرموو : " أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد ؛ فأكثروا الدعاء [ فيـه ] " [٤١٢] ، واتە : نزیك ترین جێگە کە بەندە لە پەروەردگاریەوە نزیك بێت ، ئەو کاتەیـە کە لە سوژدەدا بێت ، جا زۆر تێیدا بپاڕێنەوە .

## درێژکردنەوەی سوژدە

وە پەیامبەری خوا ﷺ سوژدەکانی ـ لە درێژیدا ـ نزیك دەکردنەوە لـە کڕنووشـەکانی ، لەوانەشـە هەنـدێك جـار زۆر درێـژی بکردایەتـەوە ، لـە بـەر هۆکارێـك ، هـەروەکو هاوەڵـە بەڕێزەکانی بۆمان دەگێڕنەوە : کە جارێکیان پەیامبەری خوا ﷺ لـە نوێـژێك لـە نوێـژەکانی ڕۆژ ـ کە نیوەڕۆ و عەسر دەگرێتەوە ـ هات بۆ لامان و ( حسن و حسين ) ـی لـە باوەشـدابوو ، پاشان ڕۆشتە پێشەوە بۆ بەرنوێژی کردنمان ( حسن و حسين ) ـــی لـە لای ڕاسـتی خۆیـەوە دانا ، پاشان تەکبیرەی ئیحرامی دابەست ، و دەستی کرد بە نوێـژ کـردن ، و سـوژدەیەکی زۆر درێژی لە نوێژەکەیدا برد هاوەڵێك دەڵێت : لە هەموو خەڵکەکە من سەرم بەرزکردەوە ، بینـیم منداڵێك بە سەر پشتی پەیامبەرەوەیـە ﷺ ، و ئـەویش لـە سـوژدەدایە ، پاشـان گەڕامـەوە سوژدەکەی خۆم ، کە پەیامبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەی بـووەوە ، و خەڵکەکـە ووتیـان : ئـەی پەیامبەری خوا ﷺ لە ناو ئەم نوێژەتدا سوژدەیەکت برد زۆر درێژت کردەوە ، تـاکو گومـانی ئەوەمان لە لا درووست بوو کە شتێك ڕووی دابێت ، یان سرووش ( الوحي ) بۆ دێتە خـوارەوە ، ئەویش فـەرمووی : " كل ذلك لم يكن ، ولكن ابنــي ارتحلنــي [٤١٣] فكرهــت أن أعجلــه

---

[٤١٢] مسلم وأبو عوانة والبيهقي وهومخرج في ( الإرواء : ٤٥٦ ) .

[٤١٣] واتە : کردوومی بە بارهەڵگر بە سوار بوونی لە سەر پشتم ، فكرهت أن أعجله : حەزم نەکرد پەلەی لێ بکەم .

حتى يقضي حاجته " [٤١٤] ، واتە : هیچ لەوانە نەبوو ، بەڵام کوڕەکەم لەسەر پشتم بوو ، بۆیە حەزم نەکرد پەلەی لێ بکەم تاکو ئیشی خۆی تەواو دەکات .

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە : " کە پەیامبەری خوا ﷺ سوژدەی دەبرد ( حسن و حسين ) دەچوونە سەر پشتی ، ئەگەر یەکێك نەیهێشتبایە ، ئاماژەی بۆ دەکردن کە وازیان لێبهێنن ، پاشان کە نوێژی تەواوکرد و خستیانیە باوەشیەوە ، فەرمووی : ( من أحبني فليحب هذين ) " [٤١٥] ، واتە : هەر کەسێ منی خۆش ئەوێ ، با ئەم دووانەی خۆشبووێ .

## چاکە ( فەزڵ ) ی سوژدە

وە پەیامبەری خوا ﷺ دەیفەرموو : " ما من أمتي من أحد إلا وأنا أعرفه يوم القيامة " ، واتە : هیچ کەسێك نیە لە ئوممەتەکەم ئیللا لەڕۆژی دوایدا من دەیناسمەوە ، ووتیان ئەی پەیامبەری خوا ﷺ لە ناو ئەو هەموو خەڵکە چۆن دەیانناسیتەوە ؟ فەرمووی : " أرأيت لو دخلت صيرة فيها خيل دُهم بُهم [٤١٦] ، وفيها فرس أغر محجل [٤١٧] ؛ أما كنت تعرفه منها ؟ " ، واتە : نابینیت تۆ ئەگەر چوویتە ناو شوێنێکەوە یەك جۆرە ئەسپی لێبوون ، وە ئەسپێکی دەست و پێ و نێو چاوان سپی تێدابوو ، ئایا لە ناو ئەو ئەسپانەدا

---

[٤١٤] النسائي وابن عساكر ( ٤ / ٢٥٧ / ١ ــ ٢ ) والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

[٤١٥] ابن خزيمة في ( صحيحه : ٨٨٧ ) بإسناد حسن عن ابن مسعود ، والبيهقي مرسلا ( ٢ / ٢٦٣ ) ، وترجم له ابن خزيمة بقوله : ( باب ذكر الدليل على أنّ الإشارة في الصلاة ــ بما يفهم المشير ــ لا تقطع الصلاة ولا تفسدها ) . قلت : وهذا من الفقه الذي حرمه أهل الرأي ! وفي الباب أحاديث أخرى في " الصحيحين " وغيرهما .

[٤١٦] ( الصيرة ) : جۆرە پەچەیەکە ( یان : گەوڕێکە ) لە بەرد و چڵی دار دروست دەکرێت بۆ ئاژەڵ ، کۆی وشەکەش ( صِيَر ) ـە ، هەروەکو لە " النهاية " ـدا هاتووە ، ووقع في الطبعات السابقة : ( الصبرة ) ، وفسر بالضم : الكومة ... وهو خطأ نبهنا عليه الشيخ بكر بن عبدالله أبو زيد في خطاب تفضل بإرساله إليّ بتاريخ (٢٠ / ٢ / ١٤٠٩ هـ) جزاه الله خيرا .

[٤١٧] ( المحجل ) : ئەو جۆرە ئەسپانەیە کە سپێتی بە پێیدا بەرز دەبێتەوە تا لە شوێنی پاوەن و مەچەکی بەرزتر دەبێتەوە ، بەڵام ناگاتە ئەژنۆکانی ، ئەو ناوەشی پێئەوترێت چونکە شوێنی ( حجل ) خرخاڵ و پێوەنەکانیەتی ، ئەم شێوەیەش نابێت تەنها لە دەستێك یان لە دەستەکانیدا بێت ، تاکو قاچێکی یان هەردوو قاچی لە گەڵدا نەبێت .

ئەو ئەسپە ناناسیتەوە ؟ فەرمووی : بەڵێ ، فەرموی : " فإن أمتي يومئذ غر [٤١٨] من السجود محجلون [٤١٩] من الوضوء " [٤٢٠] ، واتە : لە ڕۆژی دواییدا ئوممەتەکەم بە هۆی سوژدەوە نێو چاوانیان سپی دەردەکەوێ ، وە دەست و پێ‌کانیان سپی دەردەکەون بە هۆی دەستنوێژگرتنەوە .

وە فەرموویەتی : " إذا أراد الله رحمةَ من أراد من أهل النار ؛ أمر الله الملائكة أن يخرجوا من يعبد الله ، فيخرجونهم ويعرفونهم بآثار السجود ، وحرم الله على النار أن تأكل أثر السجود ، فيخرجون من النار ، فكل ابن آدم تأكله النار إلا أثر السجود " [٤٢١] ، واتە : ئەگەر خوای پەروەردگار بیەوێ میهرەبانی خۆی بڕێژێت بەسەر بەندەیەکیدا لە ئەهلی دۆزەخ ، ئەوا فەرمان دەکات بە فریشتەکانی ئەو کەسانە دەربکەن کە خوای پەروەردگاریان پەرستوە ، دەیانهێننە دەرەوە ، و بە شوێنەواری سوژدەکانیانەوە دەیانناسنەوە ، چونکە خوای پەروەردگاریش قەدەغەی کردووە لەسەر ئاگری دۆزەخ شوێنەواری سوژدەکانیان بخوات ، بۆیە بە هۆیەوە دەریان دەکەن لە ئاگری دۆزەخ ، هەموو جەستەی نەوەکانی ئادەم ئاگری دۆزەخ دەیخوات جگە لە شوێنەواری سوژدەکەی نەبێت .

---

[٤١٨] ( الغرة ) : سپێتی ڕوخساریانە ، مەبەستی : سپێتی ڕوخساریانە بە نوری دەستنوێژ .

[٤١٩] واتە : " سپێتی شوێنەواری دەستنوێژ لەدەستەکان و ڕوومەت و پێ‌کان ، سپێتی دەستەکان و ڕوومەت و پێ‌کانی ئەسپی شوبهاندووە بەسپێتی شوێنەواری دەستنوێژ لەدەست و ڕوومەت و پێ‌کانی نوێژگەردا " ( النهاية ) .

[٤٢٠] أحمد بسند صحيح ، والترمذي بعضه وصححه ، وهو مخرج في " الصحيحة " .

[٤٢١] البخاري ومسلم ، لە فەرموودەیەشدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە نوێژگەرە تاوان بارەکان بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا نامێننەوە ، هەروەها ئەو کەسەش کە بە تەمەڵیەوە تەرکی کردبێ ـ بەهەمان شێوە ـ بۆ هەمیشەیی لە دۆزەخدا نامێنێتەوە ، بڕوانە ( الصحيحة : ٢٠٥٤ ) .

## سوژدە بردن لەسەر زەوی و حەسیر

وە زۆرجار لەسەر زەوی سوژدەی دەبرد [٤٢٢] .

وە " هاوەڵانی لە هاوینی زۆر گەرمدا لە پشتیەوە نوێژیان دەکرد ، لەو کاتە ئەگەر یەکێکیان نەیتوانایە نێو چاوانی بخاتە سەر زەوی ، کراسەکەی ڕادەخست و سوژدەی لەسەر دەبرد " [٤٢٣] .

وە دەیفەرموو : " ... وجعلت الأرض كلها لي ولأمتي مسجداً وطهوراً ، فأينما أدركت رجلا من أمتي الصلاة ؛ فعنده مسجده ، وعنده طهوره ، [ وكان من قبلي يعظمون ذلك ، إنما كانوا يصلون في كنائسهم وبيعهم ] " [٤٢٤] ، واتە : ... وە هەموو زەوی بۆ خۆم و ئوممەتەکەم کراوە بە جێگەی نوێژ و بە پاك کەرەوەش دانروە ، جا هەرکەسێك لە ئوممەتەکەم کاتی نوێژی بەسەرداهات ئەوا جێگەی نوێژ و پاك کەرەوەشی لە لایە ، [ بەڵام ئوممەتانی پێش من ئەوەیان بە گەورە دادەنا ، بەڵکو تەنها بۆیان هەبوو لە پەرستگاکانیان نوێژ بکەن ( کە کەنیسەی خاچ پەرستەکان و بیەعی ( پەرستگای ) گاورەکان دەگرێتەوە ) ] .

وە جاری واش هەبوو سوژدەی لە ناو قوڕاودا دەبرد ، ئەو ڕووداوەش لە شەوی بیست و یەکی ڕەمەزاندا ڕوویدا کاتێك ، کە باران باری و سەربانی مزگەوتەکە تکەی دەکرد ، سەربانی مزگەوتەکەش لەو کاتەدا لە پەلکی دار خورما درووست کرابوو ، پەیامبەری خواش ﷺ لە ناو قوڕاوی مزگەوتەکەدا سوژدەی دەبرد ، ( أبو سعيد الخدري ) رضي الله عنه

---

[٤٢٢] چونکە : مزگەوتەکەی پەیامبەری خوا ﷺ بە حەسیر و هاوشێوەکانی ناو فەرش نەکرابوو ، فەرموودەیەکی زۆر هەن بەڵگەن بۆ ئەم وتەیە ، لەوانەش ئەو فەرموودەیەی کە دوای ئەم فەرموودەیە دێت وە فەرموودەکەی ( أبو سعيد الخدري ) .

[٤٢٣] مسلم وأبو عوانة .

[٤٢٤] أحمد والسراج والبيهقي بسند صحيح .

دەفەرموویێت : بە چاوی خۆم نێوچاوان و لووتی پەیامبەری خوام بینی ﷺ شوێنەواری قوڕاوەکەی پێوە بوو [٤٢٥] .

وە " جاری واش هەبوو نوێژی لەسەر شتێك دەکرد کە تەنها شوێنی نێو چاوانی دەکردەوە ئەو شتەش پێی دەوترێت ( الخمرة ) " [٤٢٦] ، یان هەندێك جار لەسەر حەسیر نوێژی دەکرد [٤٢٧] ، ( حەسیرێکی وا لە زۆری مانەوەی یان لە کۆنێتیدا ڕەش هەڵگەڕابوو ) [٤٢٨] .

## هەستانەوە لە سوژدە

پاشان " پەیامبەری خوا ﷺ ( الله أكبر ) ی دەکرد و سەری بەرز دەکردەوە [٤٢٩] ، و فەرمانیشی بەم کارە کردووە بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ، و پێی فەرموو : " لا يتم صلاة لأحد من الناس حتى ... يسجد حتى تطمئن مفاصله ثم يقول : ( الله أكبر ) ، و يرفع رأسه حتى يستوي قاعدا " [٤٣٠] ، واتە : نوێژی هیچ موسڵمانێك تەواو نیە تاکو ... سوژدەنەبات و ئەندامەکانیشی تێیدا ئارام نەگرێت ، پاشان بڵێت : ( الله أكبر ) و سەری بەرز بکاتەوە تاکو ڕاست دەبێتەوە .

---

[٤٢٥] البخاري ومسلم .

[٤٢٦] البخاري ومسلم ، وە ( الخمرة ) واتە : ئەوەندەی کە نوێژگەر بتوانێت لە سوژدەکەیدا نێوچاوانی بخاتە سەر ، حەسیر بێت یان ئەو حەسیرەی کە لە پەلکە ( سعف ) ی دارخورما دروست کرابێت ، یان لە پەلکی هەر ڕووەکێکی تر دروست کرابێت ، وە پێی ناوترێت ( خمرة ) ئەگەر لە ئەوەندە زیاتر بێت . " النهاية ".

[٤٢٧] مسلم وأبو عوانة .

[٤٢٨] البخاري ومسلم ، وفي الحديث دليل على أن الجلوس على شيء ما ؛ هو ليس له ، فيدل على تحريم الجلوس على الحرير ؛ لثبوت النهي عن لبسه في " الصحيحين " وغيرهما ، بل ورد فيهما النهي الصريح عن الجلوس عليه ، فلا تغتر بمن أباحه من الكبار .

[٤٢٩] البخاري ومسلم .

[٤٣٠] أبو داود والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

وە هەندێك جار " دەستەكانیشی لە گەڵ ئەم تەكبیرەدا بەرز دەكردەوە " [٤٣١] .

پاشان " پێی چەپی ڕادەخست و بە ئارامی لەسەری دادەنیشت " [٤٣٢] ، و فەرمانیشی بەو پیاوە كردووە كە نوێژەكەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ، و پێی فەرمووە : " إذا سجدتَ فمكن لسجودك ، فإذا رفعتَ فاقعد على فخذك اليسرى " [٤٣٣] ، واتە : ئەگەر سوژدەت برد پەلە مەكە لە سوژدەكەتدا تاكو جێگیر دەبیت ( واتە : ئارام دەگریت ) ، وە كە لە سوژدەكەت ڕاست بوویتەوە لەسەر ڕانی چەپت دانیشە .

وە " پێی ڕاستی دەچەقاند بە زەویدا " [٤٣٤] .

وە " پەنجەكانی پێی ڕاستی ڕوو دەكرد لە قیبلە " [٤٣٥] .

## ( الإقعاء ) ڕانەخستنی پێكان ، و دانیشتن لەسەریان لە نێوان سوژدەكاندا

وە ـ جاری وا هەبوو ـ " هەردوو پاژنە و سنگی پێ‌كانی ڕێك ڕادەوەستان ـ واتە : ڕایانی نەدەخست ـ و لەنێوان سوژدەكاندا لەسەریان دادەنیشت ، كە پێی دەوترێت ( الإقعاء ) " [٤٣٦] .

---

[٤٣١] أحمد وأبو داود بسند صحيح ، دەست بەرزكردنەوە لێرە ، و لە هەموو ( الله أكبر ) ێك دا ووتەی پێشەوا ( أحمد ) ـە ، لە " البدائع " ـی ( ابن القيم ) ( ٨٩/٤ ) ـدا هاتووە : " ( الأثرم ) لێی ئەگێڕێتەوە ( لە ڕاستیدا : ابن الأثرم ) ـە ، كە سەبارەت بە دەست بەرزكردنەوە پرسیاری لێكراوە ؟ ئەویش فەرموویەتی : لە هەموو نزمبوونەوە و بەرزبوونەوەیەك ، پاشان فەرمووی : پێشەوا ( أبو عبدالله ) ـم بینی لە نوێژدا لە هەموو نزمبوونەوە و بەرزبوونەوەیەك دەستەكانی بەرز دەكردەوە " .

[٤٣٢] البخاري في " جزء رفع اليدين " أبو داود بسند صحيح ، ومسلم وأبو عوانة ، وهو مخرج في ( الإرواء : ٣١٦ ) .

[٤٣٣] أحمد وأبو داود بسند جيد .

[٤٣٤] البخاري والبيهقي .

[٤٣٥] النسائي بسند صحيح .

[٤٣٦] مسلم وأبو عوانة وأبو الشيخ في " ما رواه أبو الزبير عن جابر " رقم : ( ١٠٤ ــ ١٠٦ ) والبيهقي .

## واجب بوونی ئارامگرتن له نێوان هەردوو سوژدەکەدا

وه " پەیامبەری خوا ﷺ له سوژدەکانیدا ئـارامی دەگـرت ، بەشـێوەیەك هـەموو بڕبڕەیەکی دەگەڕایەوە جێی خۆی " (٤٣٧) ، وه فەرمانیشی پێ کردووه بـەو پیـاوەی کـه نوێژەکەی به تەواوی ئەنجام نەدا ، و پێی فـەرمووه : " لا تتم صلاة أحدكم حتى يفعـل ذلك " (٤٣٨) ، واته : نوێژی هیچ یەکێ له ئێوه تەواو نیه تاکو ئەو شته ئەنجام نەدات .

وه " ئـەوەنـدە درێژی دەکردەوه تاکو ـ له درێـژیدا ـ نزیك دەبووەوه له سـوژدەکانی " (٤٣٩) ، وه هەندێك جار " ئەوەندە دەمایەوه تاکو کەسی وا هەبوو دەیووت : له وانەیه له بیری چوو بێت " (٤٤٠) .

---

پێشەوا ( ابن القيم ) ـ بەڕەحمەت بێت ـ لـەوە بەسەهودا چووه که پاش ئەوەی باسی شێوە دانیشتنی ڕاخستن ( الإفتراش ) ـی پەیامبەری خوای کردووه ﷺ له نێوان سوژدەکان فەرموویەتی : " جگه لەم دانیشتنه لـه پەیامبەری خواوه ﷺ هیچ دانیشتنێکی ترمان پێنەگەشتووه " !

دەڵێم : ئەم ووتەیه چۆن دەبێت له کاتێکدا شێوە دانیشتنی ( الإقعاء / واته : جووت کردنی هـەردوو پـێ و ڕانەخستنیان و دانیشتن له سەریان ) لێیەوە هاتووه ، من حديث ابن عباس في " صحيح مسلم " و أبـي داود والترمذي وصححه ، وغيرهم ؟ انظر ( الصحيحة : ٣٨٣ ) ، ومن حديث ابن عمر بسند حسن عند البيهقي وصححه ابن حجر ، وروى أبو إسحاق الحربي في ( غريب الحديث : ج٥ / ١٢ / ١ ) عن طاووس أنه رأى ابن عمر وابن عباس يقعيان ، وسنده صحيح . ورحم الله الإمام مالك حيث قال : " ما منا من أحـد إلا رَدَّ ورُدَّ عليه إلا صاحب هذا القبر " ، وأشار إلى قبر رسول الله ﷺ ، وقد عمل بهذه السنة جماعة من الـصحابة والتابعين وغيرهم ، وقد فصلت القول في ذلك في " الأصل " .

(٤٣٧) أبو داود والبيهقي بسند صحيح .

(٤٣٨) أبو داود والحاكم وصححه ووافقه الذهبي .

(٤٣٩) البخاري ومسلم .

(٤٤٠) البخاري ومسلم ، پێشەوا ( ابن القيم ) فەرموویەتی : " ئەم سوننەته دوای نەمانی سـەردەمی هـاوەڵانی پەیامبەری خوا ﷺ خەڵکانێکی زۆر وازیان لێهێناوه ، بەڵام ئەو کەسـەی کـه سـوننەتی پەیامبـەری خـوا ﷺ جێبەجێ بکات ، و لانەکاتەوه لەوەی که پێچەوانەی بێت ، گوێی نیه بەوەی که پێچەوانەی ئەمه بێت " .

## زیکری نێوان دوو سوژدەکە

وە پەیامبەری خوا ﷺ لەم دانیشتنەیدا دەیفەرموو :

١ - " اللهم ( یان لە گۆ ( لفظ ) ێکی تردا : رب ) ! اغفر لي ، وارحمني [ واجبرني ] ، [ وارفعني ] ، واهدني ، [ وعافني ] ، وارزقني " [٤٤١] .

وە جاری واش هەبوو دەیفەرموو :

٢ - " رب اغفر لي ، رب اغفر لي " [٤٤٢] .

ئەم دووانەی لە شەو نوێژدا دەووت [٤٤٣] .

پاشان " ( الله أكبر ) ـی دەکرد ، و سوژدەی دووەمی دەبرد " [٤٤٤] ، و فەرمانیشی پێ کردووە بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ، وە پاش ئەوەی کە فەرمانی پێکردوە بە ئارامگرتن لە نێوان سوژدەکانیدا هەروەکو لە پێشدا باسکرا پێی فەرمووە : " ثم تقول : ( الله أكبر ) ثم تسجد حتى تطمئن مفاصلك ، [ ثم افعل ذلك في صلاتك

---

[٤٤١] أبو داود والترمذي وابن ماجه وصححه الحاكم ووافقه الذهبي .

[٤٤٢] ابن ماجه بسند حسن ، پێشەوا ( أحمد ) یش ئەمەی هەڵبژاردووە بۆ پاڕانەوە ، ( إسحاق ابن راهويه ) فەرموویەتی : " ئەگەر بیەوێ ئەتوانێت سێجار ئەوە بڵێت ، ئەگەر بیەوێ ئەتوانێت بڵێت : اللهم ! اغفر لي ... چونکە هەردووکیان لە پەیامبەری خواوە ﷺ پێمان گەیشتووە کە لە نێوان سوژدەکاندا وتبێتی " . كذا في " مسائل الإمام أحمد وإسحاق بن راهويه " رواية إسحاق المروزي ( ص ١٩ ) .

[٤٤٣] وە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە نابێت ئەم ویردانە لە نوێژە فەرزەکاندا بووترێت ، لە بەر نەبوونی جیاوازی لە نێوان فەرز و سوننەتدا ، ئەمەش بۆچوونی پێشەوا شافعي و أحمد و إسحاقە ، وادەبینن کە ئەمە ڕەوایە لە فەرز و سوننەتدا ، هەروەکو پێشەوا ( الترمذي ) بۆمانی دەگێڕێتەوە ، وە پێشەوا ( الطبراني ) ش بۆ ئەوە دەچێت هەروەکو لە " مشكل الآثار " ـدا هاتووە ، وە دید و بۆچوونی ڕەواش ئەوە پەسەند دەکات ، چونکە هیچ شوێنێکی نوێژ نیە زیکری تێدا نەکرێت ، بۆیە پێویستە لێرەشدا هەروەها بێت ، ئەوەش شتێکی ئاشکرایە و لە لای کەس شاراوە نیە .

[٤٤٤] البخاري ومسلم .

كلها ] " [٤٤٥] ، واتە : پاشان دەڵێیت : ( الله أكبر ) و سوژدە دەبەیت ، تاکو جومگەکانت ئارام دەگرن ، پاشان ئەو کارە لە هەموو نوێژەکەتدا ئەنجام بدە .

وە هەندێك جار " پەیامبەری خوا ﷺ لە گەڵ ئەم تەکبیرەدا هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە " [٤٤٦] .

لەم سوژدەیەشدا هەمان شتی ئەنجام دەدا کە لە سوژدەی یەکەمدا ئەنجامی دابوو ، پاشان ( الله أكبر ) ـی دکرد ، و ڕاست دەبووەوە [٤٤٧] .

وە فەرمانیشی پێ کردووە بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ، و پێی فەرمووە پاش ئەوەی کە فەرمانی پێکردوە بە سوژدەی دووەم هەروەکو لە پێشدا باس کرا ، " و دواتر سەر ڕاست دەکاتەوە و ( الله أكبر ) دەکات " [٤٤٨] ، وە فەرمووە : " [ ثم اصنع ذلك في كل ركعة وسجدة ] ، فإذا فعلت ذلك ؛ فقد تمت صلاتك ، وإن أنقصت منه شيئا ؛ أنقصت من صلاتك " [٤٤٩] ، واتە : پاشان ئەوانە لە هەموو ڕکات و سوژدەیەك دا ئەنجام بدە ، ئەگەر هەموو ئەوانەت ئەنجام دا ئەوا نوێژەکەت تەواوە ، وە ئەگەر شتێکت لێ ئەنجام نەدا ئەوا نوێژەکەت بە تەواوی ئەنجام نەداوە .

وە هەندێك جار " هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە " [٤٥٠] .

---

[٤٤٥] أبو داود وصححه الحاكم ووافقه الذهبي . والزيادة للبخاري ومسلم .

[٤٤٦] أبو عوانة وأبو داود بسندين صحيحين ، وقد قال بهذا الرفع أحمد ومالك والشافعي في رواية عنهما .

[٤٤٧] مسلم والبخاري .

[٤٤٨] أبو داود وصححه الحاكم ووافقه الذهبي .

[٤٤٩] أحمد والترمذي وصححه .

[٤٥٠] أبو عوانة وأبو داود بسندين صحيحين ، وقد قال بهذا الرفع أحمد ومالك والشافعي في رواية عنهما .

## پشووه دانیشتن ( جلسة الإستراحة )

پاشان " ڕاست دەبووەوە ، و لەسەر پێی چەپی دادەنیشت ، تاکو هەموو ئەندامێکی دەڕۆشتەوە جێگەی خۆی " [٤٥١] .

## متمانە کردنە سەر دەستەکان لەکاتی هەستانەوە بۆ ڕکاتەکانی تر

پاشان " پەیامبەری خوا ﷺ هەڵدەسایەوە بۆ ڕکاتی دووەم ، و لە هەستانەوەیدا متمانەی دەکردە سەر دەستەکانی بۆ هەستانەوەی لە زەوی " [٤٥٢] .

وە " وەکو هەویر شێلی دەکرد : واتە : کاتێك هەڵدەسایەوە متمانەی دەکردە سەر دەستەکانی " [٤٥٣] .

---

[٤٥١] البخاري وأبو داود ، ئەم دانیشتنە لە لای زانایان بە ( جلسة الإسترحة ) دەناسرێت ، ئەمەش ووتەی پێشەوا ( شافعي ) یە ، و هاوشێوەکەشی لە ( أحمد ) ـەوە دگێڕنەوە هەروەکو لە ( التحقيق : ١١١ / ١ ) ـدا هاتووە ئەمەش شایستەترە بە ( أحمد ) ـەوە لەبەر ئەوەی کە لێیەوە زانراوە لە شوێنکەوتنی بۆ ئەو سوننەتانەی کە پێچەوانەیان نیە .

وقد قال ابن هانيء في ( مسائله : ٥٧/١ ) عن الإمام أحمد : " رأيت أبا عبدالله ( يعني : الإمام أحمد ) ربما يتوكأ على يديه إذا قام في الركعة الأخيرة ، وربما استوى جالساً ، ثم ينهض " ، وهو اختيار الإمام إسحاق بن راهويه ، فقد قال في ( مسائل المروزي : ٢/١٤٧/١ ) : " سوننەت لە پەیامبەری خواوە ﷺ ئەوەیە کە متمانە بکرێتە سەر دەستەکان لە هەستاندا ، پیر بێت یان لاو " ، بڕوانە ( الإرواء : ٢ / ٨٢ ــ ٨٣ ) .

[٤٥٢] الشافعي والبخاري .

[٤٥٣] رواه أبو إسحاق بسند صالح ، ومعناه عند البيهقي بسند صحيح ، بەڵام سەبارەت بەو فەرموودەیەی کە تێایدا هاتووە : " كان يقوم كالسهم لا يعتمد على يديه " ئەوا " موضوع " ـە ، هەموو ئەو فەرموودانەش کە لەم وتەیەدا هاتووە ئەوا " ضعيف " ـەو " صحيح " نیە ، ئەوەشم لە ( الضعيفة : ٥٦٢ و ٩٢٩ و ٩٦٨ ) ـدا بە تێرو تەسەلی ڕوون کردۆتەوە .

وقد أشكل على بعض الفضلاء تقويتي لإسناد الحربي بسند صالح ، فأوضحت ذلك في كتابي " تمام المنة في التعليق على فقه السنة " فراجعه فإنه مهم .

وه " پەیامبەری خوا ﷺ ئەگەر هەڵسایەتەوە بۆ ڕکاتی دووەم ، بە ﴿ الحمد لله ﴾ دەستی پێدەکرد ، و بێدەنگ نەدەبوو " (٤٥٤) .

وە لەم ڕکاتەشدا هەموو ئەوانەی دووبارە دەکردەوە کە لەڕکاتی یەکەمدا ئەنجامی دەدان ، جگە لەوە نەبێت کە کورت تری دەکردەوە لە ڕکاتی یەکەم هەروەکو لە پێشدا باس کرا .

## واجبە لە هەموو ڕکاتێکدا سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ بخوێنرێت

وە فەرمانیشی بەو پیاوە کردووە کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ، کە سورەتی : ﴿ الفاتحة ﴾ لە هەموو ڕکاتێکدا بخوێنێتەوە ، و پاش ئەوەی کە فەرمانی پێکردووە لە ڕکاتی یەکەمدا بیخوێنێتەوە ، پێی فەرموو (٤٥٥) : " ثم افعل ذلك في صلاتك كلها " (٤٥٦) ، واتە : پاشان ئەوانە لە هەموو نوێژەکەتدا ئەنجام بدە .

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : " في كل ركعة " (٤٥٧) ، واتە : لە هەموو ڕکاتێکدا .

وە فەرموویەتی : " في كل ركعة قراءة " (٤٥٨) ، واتە : لە هەموو ڕکاتێک دا خوێندنەوە هەیە .

---

(٤٥٤) مسلم وأبو عوانة ، ئەم بێدەنگ بوونە ( سكوت ) ـە کە نەفی کراوە لە فەرموودەکەدا لەوانەیە ئەو بێدەنگ بوونە بێت کە بۆ خوێندنەوەی زیکری دەست پێکردنی نوێژ دەکرێت ، بۆیە ئەو بێ دەنگ بوونە ناگرێتەوە کە بۆ ( الإستعاذة ) دەکرێت ، لەوانەشە لەوە فراوانتر بگرێتەوە ، لە هەموویشیان ڕاست و لە پێش تر لە لای من ئەوەیە کە ئەم بێدەنگ بوونە ئەو بێدەنگ بوونەیە کە بۆ خوێندنەوەی زیکری دەستپێکردنی نوێژ دەکرێت ، سەبارەت بە ( الإستعاذة ) ـەش لە جگە لە ڕکاتی یەکەمدا زانایان دوو بۆچونیان هەیە ، لە هەر دووکیشیان ڕاست و ئەولاتر لە لای من ئەوەیە کە شەرعیە لە هەموو ڕکاتێکدا بووترێت ، ڕوونکردنەوەی تەواوی ئەم باسە لە " أصل " ـی ئەم کتێبەدا هاتووە .

(٤٥٥) أبو داود وأحمد بسند قوي .

(٤٥٦) البخاري ومسلم .

(٤٥٧) أحمد بسند جيد .

## تەحییاتی یەکەم
## شێوازی دانیشتن لەم تەحییاتدا

پاشان " پەیامبەری خوا ﷺ دوای کۆتایی هاتنی ڕکاتی دووەم بۆ تەحییات خوێندنەوە دادەنیشت ، جا ئەگەر نوێژەکە دوو ڕکاتی بوایە بەشێوەیەك دادەنیشت پێی دەوترێت : " الإفتراش " [٤٥٩] هەروەکو چۆن لە نێوان سوژدەکاندا دادەنیشت .

وە بە هەمان شێوەش " دادەنیشت لە تەحییاتی یەکەمی " [٤٦٠] نوێژە سێ ڕکاتی و چوار ڕکاتیەکاندا .

وە فەرمانیشی بەوە کردووە بەو پیاوەی کە نوێژەکەی بە تەواوی ئەنجام نەدا ، و پێی فەرمووە : " فإذا جلست في وسط الصلاة فاطمئن وافترش فخذك اليسرى ثم تشهد " [٤٦١] ، واتە : ئەگەر لە ناوەڕاستی نوێژەکەتدا دانیشتیت ، ئارام بگرە ، و ڕانی چەپت ڕابخە ، و لەسەری دانیشە ، پاشان تەحییات بخوێنەوە .

وە ( أبو هريرة ) ﵁ فەرموویەتی : خۆشەویستەکەم پەیامبەری خوا ﷺ نەهی لێ کردووم وەکو دانیشتنی سەگ دابنیشم کە پێی دەوترێت ( الإقعاء ) [٤٦٢] .

---

[٤٥٨] ابن ماجه وابن حبان في " صحيحه " وأحمد في ( مسائل ابن هانيء : ١ / ٥٢ ) وقال جابر : " من صلى ركعة لوم يقرأ فيها بأم القرآن ؛ فلم يصل ؛ إلا وراء الإمام " . رواه مالك في " الموطأ " .

[٤٥٩] النسائي ( ١ / ١٧٣ ) بسند صحيح .

[٤٦٠] البخاري وأبو داود .

[٤٦١] أبو داود والبيهقي بسند جيد .

[٤٦٢] الطيالسي وأحمد وابن أبي شية ، انظر التعليق ( ٤ : ص ١٣١ ) ، و ( الإقعاء ) ؛ ( أبو عبيده وجگە لەویش ) فەرموویانە : " بریتیە لە دانانی هەردوو بەشی پاشەوەی لەسەر زەوی و دانانی هەردوو پێی و دانانی دەستەکانی لە سەر زەوی هەروەکو سەگ دادەنیشێت " .

دەڵێم : ئەم جۆرە دانیشتنە کە پێی دەوترێت ( إقعاء ) ، ئەو ( إقعاء ) ـە نیە کە سوننەتە لە نێوان سوژدەکاندا بکرێت .

وه له فەرموودەیەکی تردا هـاتووە : " كان ينهى عن عقبة الـشيطان " [٤٦٣] ، واتـە : پەیامبـەری خـوا ﷺ نـەهی کـردووە لـە شـێوەی دانیـشتنی شـەیتان ـ وە شـێوەی دانیشتنەکەی لە دانیشتنی سەگ دەچێت ـ .

وە " کە بۆ تەحییات خوێندن دادەنیشت ، لەپی ( ناو دەست ) ـی ڕاستی لەسـەر ئەژنۆ ( لـە ڕیـوایەتێکی تردا هاتووە : ڕانی ) ـی ڕاسـتی دادەنـا ، و لـەپی چەپیـشی لەسەر ئەژنۆ ( لـــە ڕیـوایـــەتێکی تـردا هـــاتووە : ڕانـی ) ـــی چـــەپی دادەنـــا [ و دەیکردەوە لەسەری ] " [٤٦٤] .

وە " پەیامبەری خوا ﷺ دەستی چەپی تاکو ئانیشك ( حدّ مرفقه [٤٦٥] ) ـی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دادەنا " [٤٦٦] .

وە " نەهیشی کرد لە پیاوێك لە کاتی دانیشتنیدا لە نوێژەکەیدا متمانەی کردبووە سەر دەستی چەپی ، و فەرمووی : " إنما صلاة اليهود " [٤٦٧] ، یان " لا تجلس هكـــذا إنما هذه جِلْسَة الذين يعذبون " [٤٦٨] ، وە یـان " هي قعدة المغضوب عليهم " [٤٦٩] ، واتە : ئەو شێوەیە شـێوەی نوێـژی گـــاورەکانە ، یـــان : وا دامـەنیـشە ، چـونکە ئـەم دانیشتنـە دانیشتنی ئـەوانەیە کـە سزا دەدرێن ، وە یان : ئەوە دانیشتنی ئەوانەیـە کـە خوای پەروەردگار لێیان تووڕە بووە و غەزەبی لێگرتوون ( واتە : جولوکەکان ) .

---

[٤٦٣] رواه مسلم وأبو عوانة وغيرهما ، وهو مخرج في ( إرواء الغليل : ٣١٦ ) .

[٤٦٤] مسلم وأبو عوانة .

[٤٦٥] واتە : کۆتایی ئانیشکی ، مەبەستیشی ئەوەیە کە : ئانیشکەکانی لە لەشی جیا و دوور نەدەکردەوە ، هەر ئەوەشە کە ( ابن القيم ) لە ( زاد المعاد ) ـدا باسی کردووە .

[٤٦٦] أبو داود والنسائي بسند صحيح .

[٤٦٧] البيهقي والحاكم وصححه ووافقه الذهبي ، وهو مخرج مع الذي في ( الإرواء : ٣٨٠ ) .

[٤٦٨] أحمد وأبو داود بسند جيد .

[٤٦٩] عبدالرزاق وصححه عبدالحق في ( أحكامه : ١٢٨٤ ـــ بتحقيقي ) .

## پەنجە جووڵاندنەوە لە کاتی تەحییات خوێندندا

وە " پەیامبەری خوا ﷺ دەستی چەپی دەکردەوە ، و لەسەر ڕانی چەپی دای دەنا ، وە هەموو پەنجەکانی دەستی ڕاستی دەنوقاند ، و ڕووە و قیبلە ئاماژەی بەو پەنجەیەی دەکرد کە دوای پەنجە گەورەکەی دێت ، و چاوی تێدەبڕی " [٤٧٠] .

وە " کاتێك ئاماژەی بە پەنجەی بکردایە ، پەنجە گەورەکەی لەسەر پەنجەی ناوەڕاستی دادەنا [٤٧١] ، وە جاری واش هەبوو " بازنەیەکی بە پەنجە گەورەکەی و پەنجەی ناوەڕاستی دروست دەکرد " [٤٧٢] .

وە " کە پەنجەی بەرز دەکردەوە ، دەیجووڵاندەوە ، و لەگەڵ جوڵاندنەوەکەیدا دەپاڕایەوە " [٤٧٣] .

---

[٤٧٠] مسلم وأبو عوانة وابن خزيمة ، وزاد فيه الحميدي في ( مسنده : ١ / ١٣١ ) ، وكذا أبو يعلى (٢٧٥/٢) بسند صحيح عن ابن عمر : " وهي مذبة الشيطان ، لا يسهو أحد وهو يقول هكذا " ، ونصب الحميدي إصبعه ، قال الحميدي : قال مسلم بن أبي مريم : " وحدثني رجلٌ أنهُ رأى الأنبياء ممثلين في كنيسةٍ في الشام في صلاتهم قائمين هكذا ، ونصب الحميدي إصبعه " .

قلت : وهذه فائدة نادرة غريبة ، وسندها إلى الرجل صحيح .

[٤٧١] مسلم وأبو عوانة .

[٤٧٢] أبو داود والنسائي وابن الجارود في ( المنتقى : ٢٠٨ ) ، وابن خزيمة ( ١/٨٦/١ ــ ٢ ) ، وابن حبان في ( صحيحه : ٤٨٥ ) بسند صحيح ، وصححه ابن الملقن ( ٢ / ٢٨ ) .

[٤٧٣] أبو داود والنسائي وابن الجارود في ( المنتقى : ٢٠٨ ) ، وابن خزيمة ( ١ / ٨٦ / ١ ــ ٢ ) ، وابن حبان في ( صحيحه : ٤٨٥ ) بسند صحيح ، وصححه ابن الملقن ( ٢ / ٢٨ ) ، ولحديث التحريك شاهد في ابن عدي ( ١ / ٢٧٨ ) وقال في روايه عثمان بن مقسم : " ضعيف يكتب حديثه " .

سەبارەت بە مەبەست بە : ( يدعو بها ) پێشەوا ( الطحاوي ) فەرموویەتی : " ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ئەمە لە کۆتایی نوێژدا بووە " .

**دەڵێم :** ئەمە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەوا سوننەتە بەردەوام بێت لە سەر ڕووکردنی پەنجەی ( شایەتومان ) بەرەو قیبلە و بەردەوامیش دەیجوڵێنێت تا سەلام دانەوە ، چونکە دوعا کردن و پاڕانەوە پێش سەلامدانەوەیە ، وە ئەمەش بۆچوونی

وە دەیفەرموو : " لَهِي أشدُّ على الشيطان من الحديد ، يعني : السَّبَّابة " [٤٧٤] ، واتە : قورس ترە لەسەر شەیتان لەوەی کە بە ئاسن لێی بدەیت ، واتە : پەنجەی شایەتومان .

وە " هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ ئەم کردارەیان لە یەکترەوە وەر دەگرت ، واتە : ئاماژەکردن بەپەنجە لە پاڕانەوەدا [٤٧٥] .

---

( مالك ) و جگە لەویشە ، وە پرسیار کرا لە ئیمامی ( ئەحمەد ) : ئایا پیاو لە نوێژدا پەنجەی دەجوڵێنێت ؟ فەمووی : بەڵێ ، زۆر بە پەلە و توندی . ئەمەش ( ابن هانئ ) باسی کردووە لە ( مسائله عن الإمام أحمد : ص ٨٠ ) .

هەروەها دەڵێم : لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە کەوا پەنجە جووڵاندن لە ناو ( تەحیات و شایەتوماندا ) سوننەتێکی سەلمێنراوە لە پەیامبەرەوە ﷺ ، ئیمامی ئەحمەد و جگە لەویش لە پێشەوایانی سوننەت کاریان پێ کردووە ، جا با ئەو کەسانە لە خوا بترسن کەوا گومانیان وایە کە ئەمە گاڵتەکردنە و لە گەڵ نوێژدا ناگونجێت ، بۆیە لەبەر کامە پەنجەیان ناجوڵێنن لە گەڵ ئەوەشدا دەزانن ئەمە سەلمێنراوە و راستە ، وە زۆر لە خۆیان دەکەن بۆ گۆڕینی ماناکەی بەوەی کەوا ناگونجێ لە گەڵ بنەواکانی زمانەوانی عەرەبی ، وە پێچەوانەی تێگەیشتنی پێشەوایانە .

وە لە شتە نامۆکان : هەندێك لەوانە پارێزگاری لە بۆچونی پێشەواکانیان دەکەن لەم بابەتەدا - با پێشەواکەشی بۆچوونەکەی پێچەوانەی سوننەتیش بێت - بە بەڵگەی ئەوەی بە هەڵە زانینی پێشەوا ئەوە دەگەیەنێت تانەی لێبدرێت و بێڕێزی دەرحەق بنوێنرێت ! کەچی ئەوەی لە یاد دەچێتەوە کە ئەم سوننەتە سەلمێنراوە رەت دەکاتەوە ، وە گاڵتەجاریش بەوانە دە کات کە کار بەم سوننەتە دەکەن ، بە زانینەوە بێت - یان بە نەزانینەوە - کەچی ئەم گاڵتەجاریەش ئەو پێشەوایانەش دەگرێتەوە کەوا ئەمان بە گومانی خۆیان پارێزگاری لە بۆچوونەکانیان دەکەن ئەگەر چی لە سەر ( باطل ) یش بێت ، لە کاتێکدا کە ئەم پێشەوایانە لەسەر سوننەتن ، بەڵکو ئەم بە گژدا چوونەی خودی پەیامبەریش ﷺ دەگرێتەوە ، چونکە پەیامبەر ئەم سوننەتەی بۆمان هێناوە ، بۆیە بەگژدا چونەوەی ئەم سوننەتە بەگژدا چوونەوەیە بۆ پەیامبەر ﷺ ، ﴿ فَمَا جَزَاءُ مَن يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنكُمْ إِلَّا ... ﴾ ؟!

بەڵام دانانی پەنجە دوای رو کردنی لە قیبلە ، یان تایبەت کردنی جولانەوەی بە کاتی وتنی ( لا إله إلاّ الله ) وە ، ئەمانە هەمووی هیچ بنەوایەکیان نیە لە سوننەتدا ، بەڵکو پێچەوانەی سوننەتە بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە .

وە فەرموودەی : " أنه كان لا يحركها " ، لە رووی سەنەدەوە سەلمێنراو نیە ، وەك چۆن لە ( ضعيف أبي داود : ١٧٥ ) سەلماندوومە ، وە ئەگەر سەلمێنراویش بێت ئەوا نەفی دەکات ، وە فەرموودەیەکی تر ئەم بابەتە دەسەلمێنێت ، وە سەلمێنەر پێش دەخرێت بە سەر نەفیکاردا ، وەك زانراوە لای زانایان ، بۆیە ئەمە نابێتە بەڵگە بۆ ئەوانەی دەڵێن پەنجە جولاندن سوننەت نیە !

[٤٧٤] أحمد والبزار وأبو جعفر ، والبختري في ( الأمالي : ١ / ٦٠ ) ، والطبراني في ( الدعاء : ق ١ / ٧٣ ) ، وعبد الغني المقدسي في ( السنن : ٢ / ١٢ ) بسند حسن ، والروياني في ( مسنده : ٢ / ٢٤٩ ) ، والبيهقي .

[٤٧٥] ابن أبي شيبة ( ٢ / ١٢٣ / ٢ ) بسند حسن .

وە " پەیامبەری خوا ﷺ لە هەموو تەحییاتدا ئەو کردارەی ئەنجام دەدا " [٤٧٦] .

وە " پیاوێکی بینی بە پەنجەی دەپاڕێتەوە ، پێی فەرموو : " أحِّـد [ أحِّـد ] " ، [ وأشار بالسَّبابة ] " [٤٧٧] .

## واجبێتی تەحییاتی یەکەم و ڕێگەپێدانی شەرع بەپاڕانەوە تێیدا

پاشان " پەیامبەری خوا ﷺ لە هەموو دوو ڕکاتێکدا تەحییاتی دەخوێندەوە " [٤٧٨] .

وە " یەکەم ووشەش کە لە دانیشتنیدا دەیفەرموو : التحيات لله " بوو [٤٧٩] .

وە " ئەگەر تەحییاتی لە دوو ڕکاتە یەکەمینەکاندا لە بیر چووبایە ، سوژدەی سەهوی بۆ دەبردن " [٤٨٠] .

وە فەرمانیشی پێدەکردن ، و دەیفەرموو : " إذا قعدتم في كل ركعتين فقولوا : التحيات إلخ ... ، وليتخير أحدكم من الدعاء أعجبه إليه ، فليدع الله عز وجل بـه ] " [٤٨١] ، وفي لفظ : " قولوا في كل جلسة : التحيات " [٤٨٢] ، واتە : ئەگەر لە هەموو دوو ڕکاتێك دا دانیشتن ئەوا بڵێن : التحيات ... هتد ، ... پاشان هەر پاڕانەوە یەکی بەدڵ بوو ، پێی بپاڕێتەوە لە خوای پەروەردگار ، وە لە گۆ ( لفظ ) ێکی تردا هاتووە ، فەرموویەتی : " لە

---

[٤٧٦] النسائي والبيهقي بسند صحيح .

[٤٧٧] ابن أبي شيبة ( ١٢ / ٤٠ / ١ ) و ( ٢ / ١٢٣ / ٢ ) ، والنسائي ، وصححه الحاكم ووافقه الذهبي ، وله شاهد عند ابن أبي شيبة .

[٤٧٨] مسلم وأبو عوانة .

[٤٧٩] رواه البيهقي من رواية عائشة بإسناد جيد ، كما قال ابن الملقن ( ٢ / ٢٨ ) .

[٤٨٠] البخاري ومسلم ، و وهو مخرج في ( إرواء الغليل : ٣٣٨ ) .

[٤٨١] النسائي وأحمد والطبراني في ( الكبير : ٣ / ٢٥ / ١ ) بسند صحيح .

دەڵێم : ڕووکەشی فەرموودەکە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە شەرعیە لە پاش هەموو تەحیاتێکدا بپاڕێتەوە ، با سەلام دانەوەشی بەدوادا نەبێت ، ئەمەش بۆچوونی ( ابن حزم ) ـ بە ڕەحمەت بێت ـ .

[٤٨٢] النسائي بسند صحيح .

